# لەگەڵ هەڵۆکان بەرز بفڕە

## کۆکردنەوەو وەرگێڕانی

ئەمیر ئەحمەد عەبدولقادر

٢٠١٥چاپی یەکەم

# بسم الله الرحمن الرحيم

ناسنامەی کتێب:

ناوی کتێب: لەگەڵ هەڵۆکان بەرز بفڕە

ئامادەکردنی: ئەمیر ئەحمەد

جۆر: چیرۆکی پەندئامیز

دیزانی بەرگ 📖 شێرزاد ئەڵماس

چاپ: یەکەم ٢٠١٥

نرخ : ٥٠٠٠ دینار

ژمارەی چاپخانە: چوارچرا

تیراژ / ١٠٠٠

لەبڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەشتیەکان ژمارە (١١٠٠)ساڵی ٢٠١٥ی پێدراوە

لەبڵاوکراوەکانی کتێبخانەی جودی لەقەڵادی
٠٧٥٠٧٣٠٥٠٢٣ یان ٠٧٧٠١٢١٤١٩٤
www.facebook.com/mwsa١٩٧٣

# پێشەکی وەرگێڕ

چیرۆك، کە بەشێکی سەرەکی ئەدەبە، وەك چۆن خاوەنی شێوازو تایبەتمەندی خۆیەتی، ئاواش خاوەنی رۆڵ و کاریگەی تایبەتییە، چیرۆك شێوازێکی بنەڕەتی و دیاری پەروەردە و فێرکردن و تێگەیاندن و پێگەیاندنە ، کەرەسە سەرەکیەکانی چیرۆك بەگشتی ئادەمیزاد و گیانلەبەرانن و لەنێو گیانلەبەرانیشدا بەتایبەتی ئاژەڵ و باڵندەیە. چیرۆك وەك ئەفسانە نوقمی خەیاڵ نابێ و بەڵکو هەقیقەتێکمان بۆ وێنا دەکات و لە بیر و زەینمانی نزیك و نزیکتر دەکاتەوە. کاریگەری چیرۆك لەوەدایە مەبەستەکانمان لە شێوەی شانۆگەریەکدا بۆ نمایش دەکات و بەزمانێکی سادەو شیکردنەوەیەکی تەواوەوە لەگەڵماندا دەدوێ و لەگەڵ دیمەنەکاندا ئاوێزانمان دەکات و بەڕوون و راشکاوی بەڵام بەئەسپایی تێمان دەگەیەنێ و دەمانگەیەنێتە لای مەبەستە سەرەکیەکە. باسەرنج دەین ! کام شتی عاسێ و سەخت و دژوار و قورس و ئاڵۆز بۆ عەقڵ و تێگەیشتنمان هەیە، بۆ روونکردنەوە و ئاسانکاری لە تێگەیشتن و وەرگرتنیدا ، پەنا بۆ چیرۆك نابەین! تا لەو رێیەوە مەبەستەکەمان بگەیێنین و بەرانبەرەکەمان بەجوانترین شێوە تێبگەیێنین!! ئەمە راستیەکەیە و ئەمە ئەو ئامانجە سەرەکی و بنەڕەتییەیە کە چیرۆکی لەپێناودا داڕێژراوەو ئێمەش لێرەدا دەمانەوێ بەخوێنەی بەڕێزی بگەیەنین. زۆر جێی سەرنجە، خوای گەورە بەوهەموو بێنیازی و توانا بێ سنوورەیەوە ، لەکتێبە بەرزو پیرۆزەکەی خۆیدا پایەو بایەخێکی گەورەو دیاری بەچیرۆك داوەو چیرۆکی بۆ کردووینە وانەو وێستگەی تێگەیاندن و دەرس و پەند لێوەرگرتن! نهێنیەکە لەوەدایە، ئەمە عەقڵی مرۆڤە ئاتاجی بەو شێوازە لە تێگەیاندن و بەرچاورِوونکردنەوە هەیەو ئەوە چیرۆکە هاوئاوازە بەئاوەز و سروشت و بونیادی مرۆڤ. کەواتە پێویستە ئێمەش وەك خۆی لە چیرۆك بڕوانین و تا دەتوانین بە شێوازێکی راست و دروست سوودی لێببینین و بیکەینە کەرەسەیەکی بەهێز و سەرەکی پەروەردەو فێرکردن و تێگەیاندن و پێگەیاندن.

ئەمیر ئەحمەدعەبدولقادر/رانیە

## پێشەکی..

یاداشت کردنی بەسەرهات و سەربوردەکانی ژیان خزمەتێکە هەر لە مرۆڤە بەخشندەو دەستکراوەکان دەوەشێتەوە تاوەکو بە چرکە ساتەکانی ژیانیان کە دەستمایەی بوونیانە ئەزموونی ژیانیان بۆ نەوەکانی داهاتوو بهۆننەوە، بەئەندازەیەك ئەم کارە دەرفەتێکی تر بۆ مرۆڤەکان دەڕەخسێنێت تا سوود لە هەڵەو کەم و کوڕیەکان وەربگیرێت، چیرۆك یەکێکە لە شارێگەکانی گێڕانەوە و گەیاندنی پەیامە ئامۆژگاری ئامێزو پەروەردەییەکان، دەتوانرێ لە رێگەیەوە بەر بەدووبارەکردنەوەی هەڵەو نەهامەتییەکان بگیرێت، پەیامەکانی چیرۆك ئاسانتر لە رێگەکانی دی دەچنە ناخی مرۆڤ و سەرسامی دەکات، چونکە بۆنی واقعیان لێ دێت و بەرهەمی ئەزموون و واقعی تاڵ و شیرینن یان [illegible]نی کەم زادەی بیرو ئەندێشەی کەسانێکی حاڵیبو و قاڵەوەبووی ژیانن، بۆیە زۆرجار مرۆڤەکان لەدەمی خوێندنەوەی چیرۆکێکدا بەرهەمێکی پاڵفتەی ئەزموونکراوی حازریان دێتە بەردەست و چارەنووسگەلێك دەبینن کە دەبوو لە پێناویا بە رۆژانی زێڕینی تەمەنی خۆیان باجی بۆ بدەن و نەهامەتی و دەردەسەری زۆری لێ بچێژن، هەرلەم سۆنگەوە ئەم کتێبەی بەردەستی تۆی خوێنەری ئازیز لەم پێشەکیە کورتە دەناسێنم، دوای بەدەستگەیشتنی ئەم کتێبە رەنگینە لە لایەن برای بەرێزم مامۆستا(ئەمیر کۆیی) بەمەبەستی خوێندنەوەو پێداچوونەوەی، ئەو بۆچوونانەی سەرەوەم زیاتر لەلا تۆختر بویەوە، کە بەراستی چیرۆك کاریگەری زۆر دروست دەکات لەسەر دەروونی مرۆڤەکان و یەکێکە لەپێداویستیە سەرەکیەکان بۆ قوتابیان و گەنج و لاوان بەتایبەت لە رۆژگارێکی وەك و ئەمرۆ کە تەکنەلۆژیا پاڵەپەستۆی زۆری لەسەر دروستکردوون، پاڵپەستۆیەك لە کاریگەریدا بێ پێشینەیە، ئەم کارەی مامۆستا (ئەمیر) وەك هەموو بەرهەمەکانی تری زۆر ناوازە و ئامانجدارە، گرنگی بەرهەمەکەش لەوەدایە کە مامۆستای ئامادەکار شەن و کەوی چەندین سەرچاوەی کردووە تا توانیویەتی بابەت و چیرۆکەکانی ئەم کتابە کۆبکاتەوەو بەشێوەیەکی نایاب وەریان بگێڕێتە سەر زمانی شیرینی کوردی تا خوێنەران و نەوەی نوێ لەم وانە بەسوودانەی ژیان بێ بەش نەبن.

خوێنەری سەنگین چیرۆکەکانی دووتوێی ئەم کتابە هەمەچەشنەن و بۆ هەموو ئاست و تەمەنەکان شیاون، تایبەتمەندیەکەی لەوەدایە کە هەموان دەتوانن لێی سوود مەند بن و وەك سەرچاوەیەکی گرنگ لێی بڕوانن، بۆیە مامۆستا تەمیر کۆیی بەم هەنگاوەی خزمەتێکی زۆر بە خوێنەران و کتێبخانەی کوردیش دەکات کە مایەی ڕێز و پێزانینە هەروەك چۆن توانیویەتی لە بواری گەشەپێدانی مرۆیی دا ناوێکی دیارو ڕاهێنەرێکی سەرکەوتوویێت.ماوەتەوە بڵێم خوێندنەوە خۆراکی رۆح و ئاسوودەیی گیانەبۆیە با خوێنەران بەدوای ئەم سەرچاوانەدا عەودالْ بن کە وەڵامگۆی ناخ و پرسیارە گرنگەکانیانن تا سەرەنجام خوێندنەوە دەبێت بە کلتورو ئێمەش وەك گەلانی پێشکەوتوو دەگەین بەلوتکەی داهێنان و ژیانێکی ئارام و پڕ لەشادی.

هەمزە عەباس فەقێ

پایزی ٢٠١٤- هەولێر

پێشکەشە بە....

- بەرۆحی پاکی دایکم ( خودا بەبەهەشتی خۆی شاد بکات، بە باوکی بەڕێزم کە ڕەنجی زۆری لەگەڵ کێشاوم.

-بەهاوسەری بەڕێزم خۆشەویستم کە هەمیشە خەم خۆر و هاندەرم بووە لە سەرجەم کایەکانی ژیان.

-بەسەرجەم ئەو هاوڕێی و خۆشەویستانەی کەهاندەرو هاوکارم بوون لە تایب کردن و چاپکردنی ئەم بەرهەمەم.

-لەسەرجەم ڕاهێنەرانی پەرەپێدانی مرۆیی .

-مامۆستا محمد عبدالرحمن کە پێداچوونەوەی بۆکردم.

## بێ ئومێد مەبە لەوانەیە ئەسپەکە بفڕێت..!




یەکێك لە پاشاکان فەرمانی لە سێدارەدانی بەسەر دوو لە داروو دەستەکانیدا دا بە هۆی ئەو تاوانەی کە کرد بوویان، ماوەی لەسێدارەدانەکەشی بەمانگێك لە دوای دەرچوونی فەرمانەکە دیاری کرد، یەکێك لە و دوو پیاوە بە تەواوی خۆی بەدەستەوە دا و بێ ئومێد بوو بۆیە خۆی خزاندە گۆشەی زیندان و چاوەڕوانی تەواو بوونی ماوەکەی دەکرد تەواو بێت و لە سێدارە بدرێت. بەڵام پیاوی دووەمیان زۆر زیرەك و بە ئومێد بوو بۆیە هەمیشە بیری دەکردەوە لە چارەسەرێك بۆ ڕزگار بوون ، یان ئەگەر تەنها درێژ کردنەوەی ماوەی زیندانیەکەش بێت بۆ درێژکردنەوەی تەمەنی........

بۆیە لە یەکێك لەشەوەکاندا بە قوڵی بیری لە پاشا و ئارەزووەکانی و ئەوشتانەی حەزی پێ دەکات و ئەوشتانەش کە ڕقی لێیان دەبێتەوە دەکردەوە......بۆیە بیری کەوتەوە...

ئەوخۆشەویستی یە زۆرەی بۆ ئەسپەکەی هەیەتی و کە زۆربەی کاتەکانی لەگەڵ ئەودا بەسەر دەبات، بۆیە بیرێکی زۆر سەیر و ترسناکی بۆهات.... هانای بۆلای دەرگەوانی

بندیخانە برد ، کە دەیەوێت چاوی بە پاشا بکەوێت کارێکی گرنگی پێ یەتی، پاشا ڕازی بوو بۆ دیداری و بینینی و پرسیاری لێ کرد لەو شتە گرنگە، بەندیەکە وتی: مـن توانـای ئـەوەم هەیە کە ئەسپەکەت فێری فڕین بکەم لە ماوەی یەك ساڵدا بەو مەرجەی لە سـێدارەدانەکەم بۆ ماوەی یەك ساڵ دوابخـەیت، بۆیـە پاشـا بـەو مەرجـە ڕازی بـوو. پاشـا لەوکاتـەدا وای بەخەیاڵدا داهات کە ئەو ئێستا سواری ئەسپە باڵدارەکەی بووە کەتاکە ئەسـپە لـە جیهانـدا بفڕیت.

بەندیەکەی تر گوێ ی لەو هەواڵە بوو بە و پەڕی سەرسوڕمانەوە پرسـیاری لـە بـرادەرە بەندیەکەی کرد: تۆ باش دەزانیت کە ئەسپ نا فڕێت ئەی چۆن توانای ئەوەت هەبوو ئـەو بیر و ڕایە شێتانەیە بخەیتە بەردەمی پاشا..؟!

بەندی یە زیرەکەکە وتی : ئەوە باش دەزانم ، بەڵام چوار شانسم بـەخۆم دا بـۆ ئـەوەی سەربەستی و ڕزگار بوون بەدەست بهێنم:

یەکەمیان: لەوانەیە لە ماوەی ئەو ساڵەدا پاشا بمرێت.

دووەمیان: لەوانەیە ئەسپەکە بمرێت!

سێیەمیان: لەوانەیە من لەو ماوەیەدا بمرم کە مردنی سەر جێگا لە سێدارە باشترە!

چوارەمیان: لەوانەیە ئەسپەکە فێری فڕین بکەم!

بۆیە تووشی هەر کێشەیەك بیت نائومێد مەبە و دەستەوەستان مەبە و تەنها مل کەچ مەکە بۆیەك چارەسەر. مێشکت بەکار بخە و دەیان چارەسەر بدۆزەوە لەوانەیە چارەسەری تـەواو و سەرکەوتن لـە یـەکێکیان دابێـت تـاقی بکـەرەوە.....زەرەر ناکـەیت...........لەوانەیـە ئەسپەکە بفڕێت و سەرت لەلاشەت جیانەبێتەوە نەفڕێت...!!

## باشترین كەس ئەوەیە كەڵكی زیاتر بێ بۆ خەڵكی



سەعید تازە زانكۆی تەواو كردبوو كاتێك چوو بۆ ئەو كۆمپانیا مەزنەی كە بە هیوا بوو لەوێ كارێكی دەست كەوێ دڵی زۆر بە خێرایی لێ ی دەدا ، چونكە ئەم كۆمپانیایە بە مەزنترین كۆمپانیای وڵات دەژمێردرێ و، خاوەنەكەشی لە هەموو دەوڵەمەندەكان دەوڵەمەند ترەو هەمووان لە هەوڵی ئەوەدان كارێكیان لەوێ دەست كەوێ لەوانەش كوڕانی گەورەپیاوان و ئەوانەی خاوەن واستەن ، ئەی ئەو چۆن ڕكابەری بكات ؟

هەموو ئەمانە و ئەویش گەنجێكی سادەیە و كوڕی فەرمانبەرێكی سادەیە كە مردووە و هیچ پارە و سامانێكی بۆ بەجێ نەهێشتووە، بەڵام وەسیەتەكەی باوكی خوا لێ خۆش بووی بیركەوتەوە كە پێی گوتبوو: پشت بە خوا ببەستە لە هەموو كارێك دا و ڕازی بە بە قەزا و قەدەری خوای گەورە هەرچیەك بێت و خەمبار نەبیت بۆ شتێك كە دەستت نە كەوتووە ڕەنگە خێر لەوە دابێ بێ ئەوەی ئەو بزانێ.

سەعید چووە ژووری بەڕێوەبەری كارو باری فەرمانبەران و ئەوراقەكانی پێشكەش كرد، سكرتێرەكە داوای لێ كرد كە چاوەڕوانی پەیوەندی تەلەفۆنی بكات . بۆ ئەوەی لە ئەنجامەكەی ئاگادار بكرێتەوە، سەعید چووە دەرەوە و ئەو زۆر لەو باوەڕەدا بوو ،كە ئەنجامەكەی ئەرێنی دەبێ. چەند ڕۆژێك تێپەڕی و لەناكاو پەیوەندی پێوەكرا(و قسەكەرەكە داوای لێ كرد ئێوارەی هەمان ڕۆژ سەردانی كۆمپانیا بكات بۆ ئەنجام دانی چاوپێكەوتن. سەعید زۆر دڵخۆش بوو و باشترین جل و بەرگی لەبەر كرد لەو جلانەی هەیبوون . بە

گوێرەی وادەکە ڕۆیشت بۆ ئەوێ و خۆی ناساند بـە فەرمانبـەری پرسـگەکە و ئـەویش بـە ڕێزەوە هەستاو پێ ی گوت: زۆر بە خێر بێ ی کاك سەعید، گەورەت کردین کاك سەعید، فەرموو بابتگەیەنمە ژووری سەرۆکی ئەنجومەنی کارگێڕی، سەعید پێ کەنی و بـە پیاوەکـەی گوت: ئەی هاوڕێم تۆ لەوانەیە تێکەڵاویەکت کردبێ لە نێوان من و کەسێکی تردا، من تەنها کەسێکی ئاسایم خوازیاری کارم !! پیاوەکە پرسیاری لێ کـرد : ئایـا تـۆ مامۆسـتا سـەعید وەحید فەرید نیت؟ وادەی کاتژمێر پێنجت هەیە؟ سەعید وەڵامی دایـەوە: بـەڵێ ئـەوە مـنم. بەزەردەخەنەیەکەوە پیاوەکە وەڵامی دایەوە: کەواتە من بە هەڵە دا نەچـووم گـەورەم وادەت لەگەڵ بەڕێز سەرۆکی ئەنجومەنی کارگێڕی کە ڕای سپاردوین بە گەرم و گوڕی پێـشوازیت لێ بکەین کە شایانی جەنابت بێت.

سـەعید لەگـەڵ فەرمانبەرەکـە ڕۆیـشت و چـووە نووسـینگەی سـەرۆکی ئەنجومـەنی کارگێڕی هەرکە فەرمانبەری پرسگەکە سعیدی ناساند هەمووان کە لە نووسـینگەکە بوون لـە بەری هەستان و زۆر ڕێزیان گرت، سەعید باوەڕی بەم دیمەنە نـەدەکرد و تـێ نەدەگەیـشت چی ڕوودەدات . ئەو دڵنیا بوو لەوەی کە تێکەڵاوی یەك ڕووی داوە و زوو هەمووان بەم شتە دەزانن و بە ناشیرین ترین شێوە وەدەری دەنێن ، ئەگەر کوڕی وەزیریش بوایە بەم گەرم و گوڕی یە پێشوازی لێ نەدەکرا.

سەعید چەند خولەکێك چاوەڕوان بوو ، ئینجا سکرتێرەکە داوای لێکرد بچێتە ژوورەوە ئەویش چووە ژووری نووسـینگەکە و کەچاوی کـەوت بـە سـەرۆکی ئەنجومـەنی کـارگێڕی دانیشتبوو کاتێ چاوی بە سعید کەوت دەسبەجێ لەسەر کورسی یەکەی هەستاو هـات بـۆ لای سـەعید و لـە باوەشـی گـرت و پـێ ی گـوت: زۆر بـە خێرهـاتی، زۆر بـەخێرهاتی خۆشەویستم، دڵخۆشت کردین.

سەعید زمانی تەتەڵەی کردوو گوتی: زۆر سوپاست دەکەم گەورەم لەسەر ئەو پێـشوازی یە گەرمە ، بەڵام من زۆر گومانم هەیە کە تۆ بە کەسێکی ترم دەزانی من پێشتر چاوم بە تۆ نە کەوتووە و تۆم لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکان نەبێت نـە دیـوە. پیاوەکـە زەردەخەیـەکی کـرد و

چووە لای مێزی نووسینگەکەی و وێنەیەکی کۆنی بچوکی دەرهێناو نیشانی سەعیدی دا و ئەویش بەبینینی ئەم وێنەیە شاگەشکە بوو وەکو ئەوەی بروسکە لێ ی بدا هاواری کرد و گوتی : ئەوە وێنەی خوالێخۆش بووی باوکمە تۆ لە کوێت بووە ئایا دەیناسی؟

پیاوەکە گوتی: خوالێخۆشبوو؟ ئایا ئەو پیاوە باشە کۆچی دوایی کرد؟ خوا ڕەحمی پێ بکات و لێ ی خۆش بێت و جێگەی بە هەشت بێت.

سەعید گوتی: بەڵام من تێناگەم چۆن یەکێك لە گەورە دەوڵەمەندەکانی وڵات باوکم دەناسێت کە ئەو پیاوێکی زۆر خاکی و خۆ بەکەم زان بووە و بەبێ وەی ژیاوە تا دوا ڕۆژی تەمەنی؟

پیاوەکە گوتی: با لەسەرەتاوە بەسەرهاتەکەت بۆ بگێڕمەوە، چەند ساڵێك لەمەوبەر کە هێشتا گەنج بووم و لە بەهاری تەمەنم دابووم ، بەڵام هەروەکو تۆ بێ پارە و پول و بێ واستە بووم، ڕۆژێك لە ڕۆژان ویستم داواکاری یەك پێشکەش بکەم بۆ کارکردن هەروەکو تۆ کە ئێستا خەریکە ئەنجامی دەدەی ، بەڵام گرفتەکە ئەوە بوو کە من هیچ پارە و پولێکم نە بوو تاکو پێ ی بچم بۆ شار کە ئیش و کارەکە لەوێ بوو بۆیە لەوێستگەی وەستانی پاسەکان بە سەرسامی و غەمباری یەوە دانیشتم و نەم دەزانی لە کوێ پارەی بلیتی سوار بوونی پاس بەدەست بێنم، هەروەها لە تەنیشتمەوە گەنجێکی تر دانیشت بوو و پرسیاری لێ کردم کە بۆچی غەمبارم ؟ منیش ڕووداوەکەم بۆ گێڕایەوە،دەستی برد بۆ گیرفانی و جزدانەکەی دەرهێنا و هەرچی پارەیەکی تێدا بوو دەری هێناو پێ ی دام، سەرم سوڕما و پێم گوت: من ناتوانم پەسندی بکەم بەڵام دوای سوور بوونی زۆری وەرم گرت و پرسیارم لێ ی کرد چۆن بۆی بگێڕمەوە؟پێ ی گوتم: ئەو خوازیاری ئەوە نی یە ، بەڵام ئەگەر خوای گەورە بەسەری کردیتەوە ئەوا پێویستە بیکەمە خێر و سەدەقەیەکی نەبڕاوە کە هەموو ڕۆژێك یارمەتی کەسێکی هەژاری پێ بدەم بێ ئەوەی بیناسم کێ یە،منیش پێم گوت: لانی کەم ناوەکەتم پێ بڵێ ئەویش پێ ی گوتم: ناوم وەحید فەریدە و هاوڕێکانم بە باوکی سەعید بانگم دەکەن، کاتێك بەجێم هێشت و ڕۆیشتم بینیم وێنەیەکی خۆی لەناو پارەکاندا لەبیر چووە منیش هەڵم گرت و پاراستوومە بۆ یادەوەری ئەم پیاوە ڕێزدارە، چووم بۆ شار بوومە فەرمانبەر و بەرز بوومەوە و، کۆمپانیای تایبەت بە خۆمم دامەزراند و ئیش و کارەکانم

گەشەیان کرد و بە شوێن باوکت دا گەڕام لە هەموو شوێنێك ، بەڵام نەم دۆزییەوە و سوێندم خوارد ڕاسپاردەکەی ون نەکەم و بیپارێزم تاوەکو لە ژیاندا بم لەو ڕۆژەوە هەموو ڕۆژێك یارمەتی کەسێکی نەناسراو دەدەم هەندێ جار لە وێستگەکانی وەستانی پاس دادەنیشم و هەندێ جاریش لە مزگەوت و هەندێ جاریش لە نەخۆشخانەکان، خوا شاهیدە تەنها ڕۆژێك نە بووە کە من یارمەتی نەدارێکم نەدابێت و هەرکاتێك سوپاسیان کردبم وتوومە پێویستە سوپاسی باوکی سەعید بکەن ، ئەگەر ئەو نە بوایە ئەوا من توانای ئەوەم نەدەبوو هاوکاریت بکەم، بۆیە کوڕەکەم بزانە کە باوکی خوالێخۆش بووت هاوبەشی منە لە هەر کارێکی خێرخوازی ئەنجامم دابێ و لە هەر خێر و سەدەقەیەك بەخشیبێتم.

چاوەکانی سەعید فرمێسکیان ڕشت و گوتی: خوا ڕەحم بە باوکم بکات هەمیشە هانی دەدام یارمەتی خەڵکی تر بدەم و پێ ی دە گوتم: ئەی کوڕی خۆم یارمەتی دروستکراوەکانی خوا بدە بە دیهێنەرەکەیان پاداشتت دەداتەوە بە باشترین شێوە لە ژیانتدا یان لە دوای مردنت یاخود منداڵەکانت لە دوای خۆت هیچ کارێکی خێرخوازی هەرچەندە بچووك بێ بەکەمی مەزانە ڕەنگە ژیانی مرۆڤێك بگۆڕێ بێ ئەوەی تۆ پێ ی بزانی.

پیاوە دەوڵەمەندەکە هەستایەوە و ئەویش چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسك و گوتی: سوێند بە خوا من بۆ خۆم داواکاری هیچ کەسێکم نە پشکنیوە لەوەتەی بیست ساڵ لە مەوبەرەوە کەسانی ترم لەبەردەستن کە ئەو کارە دەکەن، بەڵام تەلەفۆنێك پاڵی پێوەنام کە لە بەڕێوەبەر داوابکەم سەرجەم دۆسیەکانی دامەزراندنی نوێ بێنێ بۆم! من بۆ خۆشم نازانم بۆچی! دەستم کرد بە پشکنینی یەکە یەکەی دۆسیەکان تا ئەوکاتەی چاوم کەوتە سەر وێنەکەت و دەسبەجێ تۆم ناسی یەوە ، چونکە تۆ دەقاو دەق وێنەی خوالێخۆش بووی باوکتی و سوپاس بۆ خوا من ئێستاکە دەتوانم چاکە و پیاوەتی و بەخشندەیی ئەو بدەمەوە، و بزانە تۆ لێرە لای خۆم دامەزراوی و لە نووسینگەی تایبەتەکەم کاردەکەی، و من سوور دەبم لەسەر ئەوەی مرۆڤێکی سەرکەوتووت لێ پەیدا بکەم کە خوالێخۆش بووی باوکت شانازیت پێوە بکات.

# فرۆشگایەك بۆ فرۆشتنی مێرد....



لە یەكێك لەشارەكان فرۆشگایەك كرایەوە بۆ فرۆشتنی (مێرد) كە ئافرەت بۆی هەبوو بچێت بۆ ئەو فرۆشگایە بۆ هەڵبژاردنی مێردێك بە ئارەزووی خۆی، بەڵام ئاگاداری یەك لە دەرگای فرۆشگاكە هەڵواسرابوو لە سەر شێوازی فرۆشتنی مێرد ئەویش: ئافرەت بۆی هەیە تەنها یەك جار بچێت بۆ ئەو فرۆشگایە! و بۆی هەیە تەنها لە یەكێك لە نهۆمەكان هەڵبژێریت یان بۆی هەیە لە نهۆمێكەوە بچێت بۆ نهۆمی سەرو تر ، بۆی نی یە جارێكی تر بێتەوە نهۆمی خوارتر دوای سەركەوتنی بۆ نهۆمی سەروو.

ئافرەتێك چوو بۆ فرۆشگاكە بۆ هەڵبژاردن و كڕینی مێردێك بۆ خۆی:

لەسەر دەرگای نهۆمی یەكەم ئەو ئاگاداری یە هەڵواسرابوو:

پیاوانی ئەو نهۆمە باوەڕیان بە خودا هەیە و خاوەنی كار و پیشەن؟

لەسەر دەرگای نهۆمی دووەم ئەو ئاگاداری یە هەڵواسرابوو:

پیاوانی ئەو نهۆمە باوەڕیان بە خودا هەیە و خاوەنی كار و پیشەن و منداڵیان زۆر خۆش

دەوێت؟

لەسەر دەرگای نهۆمی سێیەم ئەو ئاگاداری یە هەڵواسرابوو:

پیاوانی ئەو نهۆمە باوەڕیان بە خودا هەیە و خاوەنی کار و پیشەن و منداڵیان زۆر خۆش دەوێت و ڕوخساریان زۆر جوان سەرنج ڕاکێشە؟ لێرەدا ئافرەتەکە دەستی کرد بەبیر کردنەوە، ئۆی...!بەڵام نا...بەردەوام دەبم لەسەرکەوتن...!!

لەسەر دەرگای نهۆمی چوارەم ئەو ئاگاداری یە هەڵواسرابوو:

پیاوانی ئەو نهۆمە باوەڕیان بە خودا هەیە و خاوەنی کار و پیشەن و منداڵیان زۆر خۆش دەوێت و ڕوخساریان زۆر جوان سەرنج ڕاکێشە و خاوەنی توانایەکی باشن بۆ چۆنیەتی هەڵس و کەوت کردن بە شێوەیەکی ڕۆمانسی لەگەڵ خێزانەکانیاندا؟سەری سوڕما لە لەرزینی قاچەکانی ئای خودایە گیان چی تر ناتوانم ڕازی دەبم، بەڵام هەر بەردەوام بوو لەسەرکەوتن!

لەسەر دەرگای نهۆمی پێنجەم ئەو ئاگاداری یە هەڵواسرابوو:

پیاوانی ئەو نهۆمە باوەڕیان بە خودا هەیە و خاوەنی کار و پیشەن و منداڵیان زۆر خۆش دەوێت و ڕوخساریان زۆر جوان سەرنج ڕاکێشە و خاوەنی توانایەکی باشن بۆ چۆنیەتی هەڵس و کەوت کردن بە شێوەیەکی ڕۆمانسی لەگەڵ خێزانەکانیاندا؟ خەریك بوو قاچەکانی توانای ڕۆیشتنیان نەمێنێت لەو نهۆمەدا لە خۆشی دا! بەڵام هەر بەردەوام بوو لەسەرکەوتن!

لەسەر دەرگای نهۆمی شەشەم ئەو ئاگاداری یە هەڵواسرابوو:

تۆ میوانی ژمارە ( ٤،٣٦٣،٠١٢ ) بۆیە لەو نهۆمەدا هیچ پیاوێکی لێ نیە بۆ فرۆشتن!! چونکە ئەو نهۆمە تایبەت کراوە بۆ بەڵگەی ئەوەی کە ئافرەت هیچ پیاوێکیان بەدڵ نیە...!! زۆرسوپاس بۆ سەردانی کردنت بۆ (فرۆشگای مێرد ) بەڵام تکایە ئاگاداری هەنگاوەکانی خۆت بە لەکاتی چوونە دەرەوەت لە فرۆشگاکەماندا هیوای ڕۆژێکی خۆشت بۆ دە خوازین....!!!؟؟؟

# تۆ بەتوانای.... بەڵام....؟



....بێ دەنگی خاوەن دەنگێکی بەرزە..... تەنها پێویستی بە هێمنی هەیە بۆ ئەوەی ببیسترێ، بێ دەنگی هونەرێکە هەوڵ بدە بەباشی ئەنجامی بدەی هەرگیز شکست نە هێنی لە هێنانەدی ئەوەی مەبەستە لە هەر کات و لە هەر هەڵویستێك.

کاتێك وتارێك دەنووسی و پێت وایە تۆ لەسەرووی ئاستی رەخنە گرتنی و، توورە دەبی لەو کەسەی رەخنەت لێ دەگرێت،تۆ و پێنووسەکەت بریتین لە کۆمەڵێك دار و تەختە کە بە نزیك بوونەوە لە هەر پریشکە ئاگرێك دەسوتێ ی،بزانە کە رەخنەبنیاد نانی پێنووس و نوێ بوونەوەیەتی، هەروەها بزانە کە نقوم بوونت بە خۆشدوانی تەنها پریشکێکە و بەردەوام نابیت.

ئایا پێشتر گوزەرت کردووە بە هەستی نەرێنی لە هەر جۆرێك بوبێت و گرانیت بەدی کردبێ لە دەرباز بوون لێ ی؟

هەمیشە کەسێك هەیە کە لە تۆ بەد بەخت هەبێت بۆیە دەم بەخەندە بەو هەمیشە لە بیرت بێت کە لە نووکی پێنووسەکەمەوەدەگەمە وێستگەکەم بۆ دانانی کتێب یان لە خولێکەوە سەرچاوەی گر تووە یان خوێندنەوەی زانیاری یەك وەرگرتنی پێویستی یەك لە تۆڕی ئەنتەرنێت لێرەوە دەستتان دەکەوێت یاخود بەدەست هێنانی شارەزایی و پسپۆڕی یەك لە ژیان.

کاتێك تەمەنی دوو مانگ بوو فیلێکی سپی، بچووك بە تەڵەوە بوو ڕاوچی یەکان گرتیان و لە پاشان بە پیاوێکی زەنگینیان فرۆشت کە خاوەنی باخچەیەکی تەواوی ئاژەڵان بوو.

کاتی گەیشتنی بۆ باخچەکە کرێکارە بەرپرسەکان هەستان بە بەستنەوەی یەکێك لە قاچەکانی فیلەکەبە زنجیرێکی ئاسنینی بە هێز کە کۆتایی یەکەی تۆپێکی گەورەی ئاسن بوو.بێ گومان فیلەکە لەو مامەڵەیە توندە هەستی بە تۆڕەیەکی زۆر کرد و بڕیاری دا خۆی لەم کۆت و بەندە ڕزگار بکات بەڵام هەر کاتێك هەوڵی جوڵەی دابا زنجیرەکە توند تر دەبوو وز هەستی بە ئازارێکی زۆر دەکرد چەند جارێك هەوڵەکانی دوو بارە کردەوە بەڵام بێ سوود بوو و ماندوو بوو و خەوی لێ کەوت.

لە چەند ڕۆژی داهاتوو هەوڵەکانی فیلەکە بەردەوام بوو بەڵام بێ هودە بوو لەگەڵ زیاتر بوونی هەوڵە شکست خواردووەکانی و ئازارەکانی فیلەکە بڕیاری دا هەوڵی خۆڕزگارکردن ڕابگرێ و بەم واقیعە تازەیە ڕازی بێت...

پاش ماوەیەك و لەکاتی خەوتنیدا کرێکارەکان بە وتەی خاوەن باخچەکە هەستان بە گۆڕینی تۆپە ئاسنینەکە بە تۆپێکی تەختەی بچووك،بێ گومان ئێستا دەرفەتەکە ڕەخساوە بۆ فیلەکە تاوەکو خۆی ڕزگار بکات.

بەڵام ئەوەی ڕوویدا بەتەوزاوی پێچەوانەی ئەمە بوو؟؟

ژیری فیلەکە بە جۆرێك بەرنامەرێژ کرا بوو کە هەر هەوڵێکی بۆ دەرباز بوون لەو کۆت و بەندانە شکست دەهێنێ و ئازارێکی زۆری بەدواوە دەبێ یاخود بەرنامە ڕێژکرانی ژیری فیلەکە لەسەر نەتوانین و بەم شێوەیە متمانەی بەهێز و توانای خۆی نەما...

یەکێك لەوانەی سەردانی باخچەکەیان کرد سەری لەوە سوڕما و پرسیاری لە خاوەنەکەی کرد: دەتوانی بۆم ڕوون بکەیتەوە چۆن ئەم فیلە بە هێزە هەوڵ نادات تۆپە تەختەکە ڕابکێشێ و خۆی ڕزگاربکات کەئەمە بۆ ئەو کارێکی زۆر سوك و ئاسانە؟؟

خاوەنی باخچەکە وەڵامی دایەوە: بێ گومان فیل زۆر بەهێزە و دەتوانێ بەئاسانی خۆی ڕزگار بکات و لە هەر کاتێك بیەوێ! من ئەوە دەزانم؟بەڵام گرنگتر لەوە ئەوەیە کە فیلەکە خۆی ئەمە نازانێ و هەست بە ڕادەی هێز و تواناتی خۆی ناکات.

ئێستاش:

زۆربەی خەڵکی لە بچووکیەوە وەها بەرنامەڕێژ دەکرێن کە قسە و مامەڵەکردن تەنانەت هەست و نەست بە شێوازێکی دیاری کراو ئەنجام بدەن و بە درێژایی ژیانیان لەسەر ئەوە بەردەوام دەبن و بوونەتە بەندەی بەرنامە ڕێژیە کەیان و بیرو باوەڕە نەرێنی یەکانیان کە سنوور بۆ تواناکانیان دادەنێت لە دەست خستنی ئەوەی مافی خۆیانە بەدەستی بهێنن لە ژیاندا، بەڵام ئەو بەرنامە ڕێژی یە دەکرێ گۆڕانکاری تێدا ئەنجام بدرێ لە بەرژەوەندی خۆمان بەوەی بیگۆڕین بەبەرنامە ڕێژیەکی تری ئەرێنی کە هاوکاریمان بکات لە هێنانەدی ئامانجەکانمان.

بزانە کە گۆڕانکاری لە ژیانتدا پێویستە یەکەم جار لە ناو خۆتدا ڕووبدات.

**((إِنَّ اللَّـــهَ لَـــا يُغَيِّـــرُ مَـــا بِقَـــوْمٍ حَتَّـــىٰ يُغَيِّـــرُوا مَـــا بِأَنفُـــسِهِمْ))**

**واتە : بێگومان خوا چارەنووس و نازو نیعمەتی خۆی لەهەر هۆزو نەتەوەیەك ناگۆڕێ و، لێیان تێکنادات تاکو ئەوان دڵ و دەروونی خۆیان نەگۆڕن بەرەو باری لارو خراپ، جا لەوکاتە خوایش ژیانیان لێ تێکدەدات**

# پەیامی باوکێك بۆ منداڵەکانی...؟؟



پیاوێك ژنێك و دوو کوڕو کچێکی هەبوو، سەفەری کرد بۆ وڵاتێکی دوور بە دوای کار و کاسبیدا و ئەوانیشی بەتەنیا بە جێهێشت، ماڵ ومنداڵەکەی لە ڕادە بەدەر ئەویان خۆش دەویست و نە پەڕی ڕێزیان لێی دەگرت.

پاش ماوەیەك لەمانەوەی لە دەرەوەی وڵات، باوکەکە نامەی یەکەمی ناراستەکردن، بەڵام منداڵەکانی نامەکەیان نەکردەوە بۆ ئەوەی بیخوێننەوە، بەڵکو هەریەکەیان نامەکەیان وەردەگرت و ماچیان دەکردو،دەیان گوت ئەم نامەیە لەلایەن بەنرخترین خۆشەویستمانەوە بۆمان هاتووە..

هەرلە دەرەوە لەنامەکە ڕادەمان و، دواتر نامەکەیان دەخستە ناو قوتوویەکی قەدیفەوە و... ناوە ناوە دەریان دەهێنا و تۆزی سەریان پاك دەکردەوە و، دووبارە لە شوێنی خۆی دامان دەنایەوە.... بەم شێوەیە لەگەڵ هەرنامەیەك کە لە باوکیانەوە بۆیان دەهات بە هەمان شێوە هەڵس و کەوتیان دەکرد.... چەند ساڵێکی پێچوو، باوکەکە لەدەرەوەی وڵات گەڕایەوە، بینی تەنها کوڕێکی لە خێزانەکەی ماوە بۆیە باوکەکە لە کوڕەکەی پرسی: دایکت لە کوێیە؟

کوڕەکە وەڵامی دایەوە: توشی نە خۆشی بوو، ئێمەش هیچ پارەیەکمان نەبوو کە لێی خەرج بکەین بۆ کڕینی داو و دەرمان، بۆیە بەم شێوەیە وەفاتی کرد؟؟

باوکەکە وتی: بۆچی؟ ئایا نامەی یەکەمتان نەکردەوە؟ بڕێکی زۆرپارەم لەگەڵ نامەکەدا بۆ نارد بوون!!

کوڕەکە وتی: نەخێر...

باوکەکە پرسی ئەی کوا براکەت؟

کوڕەکە وتی: تووشی برادەرایەتی چەند کەسێکی خراپ بوو پاش مردنی دایکم کەس نە بوو ئامۆژگاری بکات و پشتیوانی لێ بکات و ڕاستی بکاتەوە، بۆیە لەگەڵ ئەواندا ڕۆیشت و وازی لە ئێمە هێنا؟

باوکەکەبە سەر سوڕمانەوە وتی: بۆچی؟ ئایا نامەی دووەمتان نەخوێندەوە، کە لە نامەکەدا داوام لێکرد بوو لە برادەری خراپ دوورکەوێتەوە و... بێت بۆ لای من!

کوڕەکە وەڵامی دایەوە وتی : نەخێر..

باوکەکە وتی: لاحول ولا قوه الا باللە... ئەی خوشکەکەت لە کوێیە؟

کوڕەکە وتی: مێردی بەو کوڕەکرد کە نامەکەت پێدا نارد بوو بۆمان و، ڕەزامەندیت دەربڕی بوو لەسەر شوو پێکردنی خوشکەکەمان؟ ئێستاش زۆر بەدبەختە بەخراپ ترین شێوە هەڵسوکەوتی لە گەڵدا دەکات...

باوکەکە بە تووڕەییەوە وتی: ئایا کۆتا نامەتان نە خوێندەوە، کە لە نامەکەمدا هەواڵی خراپی ڕەوشت و ناکاری ئەو کوڕەم تێدا ڕوون کردبوە و، ناقایل بوونی خۆشم تێدا ڕوون کرد بوەوە بۆ ئەم هاوسەرگیرییە؟

کوڕەکە وتی: نەخێر هەرهەموو نامەکانمان لەو قتوە قەدیفەیەدا پاراستبوو و هەڵمان گرتبوون... هەمیشە بەڕێزەوە دەرمان دەکرد و ماچمان دەکردن، بەڵام نەمان دەخوێندنەوە و تەماشای ناوەڕۆکەکەیمان نەدەکردن؟؟

ئایا بیرت لە حاڵ و باڵی ئەم خێزانە کردۆتەوە و بەباشی تێی ڕاماوی؟ کەوا چۆن لەبەر یەك هەڵوەشاوە و پارچەپارچە بووە ، ژیانیان لێ تاڵ بووە،تەنها لە بەر ئەوەی نامەکانی باوکیان نەدەخوێندەوە کە بۆیانی دەناردن و سودیان لێوەرنەدەگرتن، بەڵکو تەنها بە ڕێز

گرتن و پارێزگاری کردنیان و هەڵگرتنیان لە نا قتوە قەدیفەکەدا، بەبێ کارپێکردن بەناوەڕۆکەکەی و ئەوەی تێیدایە... دواتر تەماشای پەڕاوەکەم کرد... تەماشای قورئانی پیرۆزم کرد، کە لە ناو قتوە قەدیفەکە هەڵمانگرتووە لەسەر کتێبخانەکەم؟ ئاە خودایە! قوربەسەرم؟

ئای منیش بەهەمان شێوەی ئەو خێزانە هەڵس و کەوتم لەگەڵ قورئانی پیرۆز، پەیامی خودا دا کرد، کە لەگەڵ نامەکانی باوکیان کردیان؟

منیش بەهەمان شێوە قورئانەکەم داخستووەو لەسەر کتێبخانەکەم دام ناوە؟بەڵام نای خوێنمەوە و سودی لێوەرناگرم؟ کەچی ئەو پەیڕە و پرۆگرامی ژیانی منە؟

بۆیە هەستام، تۆبەم کردو، قورئانەکەم دەرهێنا و... کردمەوە..بڕیارم دا لەمەو دوا بەهیچ شێوەیەك بەم شێوەیە بەجێی نەهێڵم..؟؟!!

# پشت بەستن بە خودا ؟



دووکەس دانیشتبوون چاویان چووە سەر دایکی ( جەعفەر) (زوبێدەی عەباسی ) کە بە ڕیگادا دەڕۆیشت کە بە نان دەر و زۆر بەخشین بە ناوبانگ بوو.

یەکێکیان وتی: خودایە بەگەورەیی خۆت ڕۆزیم فراوان بکەو یارمەتیم بدەی..

دووەمیان وتی: خودایە بەگەورەیی دایکی ( جەعفەر ) ڕۆزیم بدە و هاوکارم بە.

دایکی ( جەعفەر ) ئەمەی زانی و بیستی لێیان، بۆیە ئەوەی داوای یارمەتی لە خودا کرد دوو درهەمی بۆ نارد،

ئەوەشیان دوای یارمەتی لەو کرد مریشکێکی سوورە وەکراوی بۆ نارد کە لە ناو سکی مریشکەکەدا دوو دیناری دانا.

خاوەن مریشکە سوورەوە کراوەکە هەموو ڕۆژێک مریشکەکەی خۆی بە کابرای تر دەفرۆشت بە دوو درهەم بەبێ ئەوەی بزانێت ئاگاداری ئەوە بێت کە دوو دیناری تێدایە؟

دە ڕۆژ لەسەر یەك بەم شێوەیە بەسەر ئەم کارەدا تێپەڕی، دایکی (جەعفر ) پێشوازی لێیان کرد،بەوەی کە داوای یارمەتی کۆمەکی لەو کردبوو وتی: ئایا کۆمەك و یارمەتی ئێمە دەوڵەمەندیان نەکردی؟

کابرا وتی: بەچ شتێك دەوڵەمەند ببم؟

دایکی ( جەعفەر ) وتی: سەد دینار لە دەرۆژ دا؟

کابرا وتی: بەڵکو مریشکێکی سوور کراوە کە هەموو ڕۆژێك بە دوو درهەم بە برادەرەکەم دەفرۆشتەوە!

دایکی ( جەعفەر ) وتی: ئەوەی کە داوای کۆمەك و یارمەتی لەمن کرد خودا بێبەشی کرد، بەڵام ئەوەی داوای کۆمەك و یارمەتی لە خودا کرد خودا پێی بە خشی و دەوڵەمەندی کرد؟؟

شێخ ( عەبدولحەمید کوشك) ڕەحمەتی خودای لێبێت دەفەرموویت:
هەر کەسێك پشت بە غەیری خودا ببەستێت سەر شۆڕ و ڕسوادەبێت
هەر کەسێك پشت بە غەیری خودا ببەستێت نەبوو و نەدار دەبێت
هەر کەسێك پشت بە غەیری خودا ببەستێت گومڕا دەبێت
هەر کەسێك پشت بە غەیری خودا ببەستێت بێتاقەت و نیگەران دەبێت

بەڵام هەر کەسێك پشت بە خودا ببەستێت نە ڕسوادەبێت و نە نەدار دەبێت و نە گومرادەبێت و نە نیگەران دەبێت....

# پیرەژنێك مانای وشەی خۆشم دەوێ ی ڕاڤەدەکات...؟



لە پیرەژنێکیان پرسی دەربارەی مانای خۆشەویستی ئەویش لەوەڵام دا گووتی: یەکەمین جار کە ئەو وشەیەم بیست منداڵێکی بچووك بووم، ئەویش لەلایەن باوکمەوە بوو کە ماچی کردم و گووتی: خۆشم دەوێ ی، منیش گوتم : خۆشەویستی ئارامی و باوەشی گەرم و بەسۆزە.

گەیشتمە تەمەنی لاوێتی نامەیەکەم لە ژێر دەرگای ماڵەوە دۆزیەوە کە کوڕی دراوسێ کەمان ناردبووی ناونیشانی منی لەسەر بوو و ناوەڕۆکەکەی بریتی بوو لەوەی کەمنی خۆشم دەوێ منیش گوتم: خۆشەویستی شێتی و بوێری یە.

لە کوڕە دراوسێکەمان مارە بڕام و یەکترمان ناسی و یەکەمین وشە کە پێ ی گوتم بریتی

بوو لەوەی خۆشم دەوێ ی، منیش گوتم :خۆشەویستی خواست و کار و ئامانج و ویستە.

لە ڕۆژی دووەمی هاوسەرگیریم، مێردەکەم سەری ماچ کردم و پێ ی گوتم تۆم خۆش دەوێ ی، منیش گوتم: خۆشەویستی ئامەزرۆیی و پەرۆشی یە.

یەکەمین منداڵم بوو، ماندوو بووم لەسەر جێگاکەم، ساڵێك تێ پەڕی: مێردەکەم هات بۆ لام و دەستی گرتم و گوتی خۆشم دەوێ ی منیش گوتم: خۆشەویستی سوپاس و پێ زانین و سۆز و بەزەیی یە.

ساڵان تێ پەڕین و سەرم سپی بوو، منداڵەکان هاوسەرگیریان کرد دوای چەندین ساڵ مێردەکەم تەماشای قژەکانی کرد بەزەردەخەنەوە پێ ی گوتم خۆشم دەوێ ی، منیش گوتم: خۆشەویستی لێ بووردەیی و سۆزداریی یە.

تەمەن بەسەر چوو و پیر بووین و هەر جارێك مێردە خۆشەویستەکەم پێم دەڵێت خۆشم دەوێ ی، دەڵێم :خۆشەویستی بریتی یە لە وەفا و ڕاستگۆیی و دڵسۆزی و بەخشین.

ئەمەیە خۆشەویستی هەرچەندە تەمەنمان زیاتر بێ نهێنی یەکانمان بۆ ئاشکرا دەبێ............ئائەمەیە خۆشەویستی بە بچووکی دەست پی دەکات ئنجا وردە وردە گەورە دەبێت لەگەڵ خۆشەویستی پاك و بێ گەردم.

# خانووەكەم بۆ فرۆشتن نی یە...؟؟



ڕۆژێكیان پیاوێـك چـوو بـۆ لای هـاوڕێ یـەكی شـارەزا لـەكڕین و فرۆشـتنی زەوی و خانووبەرەدا......و داوای لێ كرد هاوكاری بكات لە نووسینی ئاگاداری یەك بۆ فرۆشـتنی خانووەكەی، هاوڕێ كەشی شارەزایەكی باشی هەبوو لە چۆنیەتی خانووەكەی بۆیە هەستا بە نووسینی وەسفێكی باش و وردی خانووەكـەی، ئامـاژەی بـە شـوێنی هەڵكـەوتنی كـە لـە شوێنێكی جوان و دڵگیرەوە و ڕێڕەوەكەی گەورەیـە و نەخـشەیەكی ئەنـدازیاری چـاكی بـۆ كراوە هەروەها خاوەنی باخچەیەك و گەرماوێكی گەورەو فراوانە و............هتد.

شارەزاكە دوای نووسین ئاگاداری یەكەی بۆ خاوەنی خانووەكـە خوێنـدەوە كـە زۆر بـە وردی و گرنگی یەوە گوێی بۆ ڕاگرتبوو دوای بیستنی وتی تكایـە جـارێكی تـر ئاگـاداری یەكەم بۆ بخوێنەوە!!

دوای دووبارە خوێندنەوەی ئاگاداری یەكە خـاوەن خانووەكـە هـاواری كـرد ئـای لـەو خانووە باشە.....

لە هەموو ژیانی خۆمدا خەوم بە وە دەبینی ببم بـە خـاوەنی خـانوێكی ئاوەهـا بـەڵام نـەم دەزانی كە بۆ خۆم تێیدا دەژیم هەتاكو گوێم لەتۆ نەبوو كە بۆت باسكردم...!!

دواتر دەستی كرد بە پێكەنین تكایە ئاگاداری یەكە بڵاو مەكەوە چونكە خانووەكـەم بـۆ فرۆشتن نی یە..!!!

چ لەو سەرگوورشتەیە فێردەبین....

پەندێکی کۆن هەیە دەڵێت ((بەخششەکانی کە خودا پێ ی داویت بژمێرە و دواتر یەکە یەکە بیان نووسە دواتر دەبینیت گیانت ئاسوودەتر دەبێت لە پێشووتر..........

ئێمە لەیادمان دەچێت سوپاسی خودا بکەین چونکە ورد نابینەوە لە بەخششەکان و نایان ژمێرین کە چەندەمان هەیە..... چونکە ئێمە تەنها ناخۆشی یەکان دەبینین بەخششەکان لەیاد دەکەین.

ئێمە گلەیی و گازەندە دەکەین چونکە پەروەردگار لە ژێر هەر گوڵێك دڕکی داناوە.... باشترە ئێمە سوپاسی پەروەردگار بکەین چونکە لەسەر دڕك گوڵی رواندووە......!!

پەندێکی تر دەڵێت: (( زۆر ئازارم چەشت کاتێك پێیەکانی خۆم بەبێ پێڵاو بینی..... بەڵام دواتر سوپاسی پەروەردگارم کرد کاتێك یەکێکم بینی کە قاچەکانی لەدەستداوە..!!

# دەنگدانەوەی ژیان....!



دەگێڕنەوە جارێکیان یەکێك لە داناکان چووە دەرەوەی شار لەگەڵ کوڕەکەی بۆ ئەوەی شارەزای بکات لە بەرزی و نزمی چواردەوری شار و لە کەشێکی پاك و بێگەرد و دوور لە ژاوەژاو و خەمەکانی شار....

هەردووکیان ڕێگای دۆڵێکی قوڵیان گرتەبەر کە بە چیای بەرز و سەرکەش دەورە درابوو...لەکاتی ڕۆیشتنیان....منداڵەکە هەڵەنگوت لە ڕۆیشتنی دا....بەسەر ئەژنۆکانیدا کەوت....

منداڵەکە هاواری کرد لە ئەنجامی ئەو ئازارەی بەری کەوت بۆ دەربڕینی ئازارەکەی بەدەنگێکی بەرز هاواری کرد ئا ئاهههههههههه

کەچی لە خوارووی دۆڵەکە گوێ بیستی دەنگێك بوو بەشداری ئازارەکەی دەکات و بە دەنگێکی بەرز و بەهەمان ئاواز دەڵێت:ئائاهههههههههههه

منداڵەکە ئازارەکەی لەبیر چوو وبەخێرایی و سەرسوڕمانەوە بۆ شوێنی دەنگەکە ڕای کرد وتی: تۆ کێ یت؟

کەچی وەڵامەکە پرسیارەکە دووبارەدەکاتەوە: تۆ کێ ی؟؟

منداڵەکە توڕە بوو لەو بەرپەرچ دانەوە بەپرسیارکردن،وەڵامی دایەوە بە دڵنیایی یەوە وتی: بەڵکو من پرسیارت لێ دەکەم

تۆ کێ ی؟

جارێکی تر وەڵامەکەی تەنها بە هەمان توندو تیژی بوو:بەڵکو من پرسیارت لێ دەکەم تـۆ کێ ی؟

منداڵەکە ژیری خۆی لەدەستدا کاتێك بەهەمان شێوە وەڵامی دایەوە بە توندی...بۆیە بە تورەیی وەڵامی دایەوە،، تۆ تر سنۆکی،،

ئایا پاداشت هەر بەهەمان شـێوەی کارەکـەو....هـەمان هێـز بەرپـەرچ دەدرێتـەوە،، تـۆ ترسنۆکی،،....

منداڵەکە ئەوکاتە تێگەیشت ئەو پێویستی بە فێر بـوونی بەشـتێکی نـوێ یـە لەژیانـدا لـە باوکی دانای فێر ببێت، کە لەتەنیـشتیەوە وەسـتاوە و بەشـداری ناکـات و دەسـت ناخاتـە ناوکارەکەی،ئەودیمەنەی کە خۆی دەرهێنەرەکەیەتی.

پێش ئەوەی منداڵەکە دەست بکات بە جنێو و قسەووتن خۆی گرت و رێگای بۆ بـاوکی کردەوە بۆ بەرێوە بردنی هەڵوێستەکە هەتاکو ئەویش خۆی بۆ پەند وەرگرتن لە چیرۆکەکە یەکلایی بکاتەوە.....

باوکەکە، وەك پیشەی هەمیشەیی، بە دانایی هەڵسـوکەوتی لەگەڵ کێشەکەدا کرد....

داوای لە کورەکەی کرد ئاگاداری وەڵامەکە بێت ئەم جارە بۆیـە لـەناو دۆڵەکـە بـانگی کرد: من رێزت دەگرم،،

بێگومان وەڵام لەشێوەی کارەکەیە....بەهەمان شێوە و بەرێزەوە: من رێزت دەگرم،،

کورەکە سەیری بە گۆرانکاری شێوەی وەڵامەکەی وەڵام دەرەوە داهات...بـەڵام باوکـە داناکە دەمەقاڵێ یەکەی تەواوکرد، تۆ چەند کەسێکی باشی،،

بێگومان وەڵامەکە هیچی کەمتر نەبوو لەو شێوازە جوانە: تۆچەند کەسێکی باشی،،

کورەکە سەری سوڕما لەوەی گوێ بیستی بوو بـەڵام لـە نهێنـی گۆرنکـاری وەڵامەکـە تێنەگەیشت، بۆیە بێدەنگ بـوو بـە وردی چـاوەڕوانی گـوێ بیـستنی ڕوونکردنـەوەی ئـەو رووداوە فیزیایە بوو لە باوکی دانای.....

پیاوە داناکە بەم شێوەیە ئەو ڕاستی یەی بە شێوەیەکی دانایی شی کردەوە، کوڕە شیرینەکەم: ئێمە ئەو دیاردەیە سروشتی یە لە جیهانی فیزیا ناودەنێین ((دەنگدانەوە ))...

بەڵام لەڕاستی دا ئەوە ژیانە بۆخۆی.....

ژیان هیچت پێ نابەخشێت تەنها بە ئەندازەی ئەوەیت دەبەخشیت....

هەروەها هەرئەوەندە ڕێزت لێ دەگرێت کە تۆ ڕێزی لێ دەگریت و بەس.....

ژیان ئاوێنەی کارەکانت و.....دەنگدانەوەی قسەکانتە...........

ئەگەر دەتەوێت یەکێك ڕێزت بگرێت ڕێزی خەڵکی تر بگرە.....

ئەگەر دەتەوێت یەکێك بەزەیی پێت دابێت بەزەیت بە خەڵکی تردا بێت.....

ئەگەر دەتەوێت یەکێك عەیبەکانت داپۆشێت عەیبی خەڵکی دا بپۆشە.........

ئەگەر دەتەوێت یەکێك هاوکاریت بکات هاوکاری خەڵکی تر بکە........

ئەگەر دەتەوێت یەکێك گوێت بۆ بگرێت بۆ ئەوەی لێت تێبگەن گوێ لە خەڵکی تر بگرە بۆئەوەی لێت تێبگەن.......

چاوەڕوانی ئارام گرتن لە خەڵکی مەکە ئەگەر یەکەم جار تۆ ئارام گر نەبیت لە گەڵیاندا.....

کوڕەشیرینەکەم....ئەوە یاسا و دەستوری خودایە کە لەسەرجەم لایەنەکانی ژیاندا جێ بە جێ دەبێت....ئەمەش یاسای بوونەوەرە کە لە سەرجەمی بەرزی و نزمی یەکانی ژیان دەی بینین....

ئەومش دەنگدانەوەی ژیانە.....ئەوەی پێشکەشت کردوە دەی بینی یەوە.....ئەوەی چاندووشتە دەی درووی تەوە...!!

# ڕاگەیاندن و پیاوە کوێرەکە



ڕۆژێك پیاوێکی کوێر لەبەردەمی یەکێك لە باڵەخانەکان دانیشت بوو و کڵاوێکی لە نێوان قاچەکانیدا دانا بوو ولەتەنیشتیەوەش پارچە تەختەیەکی لابوو لەسەری نووسرابوو(( تکایە هاوکاریم بکەن من کوێرم))!

پیاوێکی ڕاگەیەندکار بەتەنیشتیدا تێپەڕی و سەیری کڵاوەکەی کرد تەنها چەند پارەیەکی کەمی تێدابوو ئەویش چەند پارەیەکی تری بۆ تێکرد.

پاشان بێ ئەوەی یارمەتی لە کوێرەکە وەربگرێت پارچە تەختەکەی هەڵگرت و دەستەواژەیەکی تری لەسەر نووسی و لە شوێنی خۆی دانیایەوە و بە ڕێگای خۆیدا ڕۆیشت.

پاش کەمێك کوێرەکە هەستی کرد کڵاوەکەی پڕ بووە لە وردەوپارە ی کاغەز، بۆیە زانی کە شتێك گۆڕاوە و هەستی کرد ئەو شتەی گوی بیستی بور لە نووسینەکە ئەوەیان ئەو گۆڕانکاریەی دروستکردووە؟ بۆیە پرساری لە یەکێك لە ڕێ بوارەکان کرد کە بە ویدا تێپەڕ دەبوون کە ئایا چ شتێك لەسەر ئەو تەختەی تەنیشتیەوە نووسراوە ؟

ئەویش پێ ی وت کە ئەمەی لەسەر نووسراوە: ( ئیمە ئێستا لە کەژی بەهار داین بەلآم من توانای بینینی ئەو جوانیەم نی یە))!

هۆکارەکانی ژیانت بگۆڕە کاتێك کار و بارەکانی ژیانت بە باشی ناڕۆن بە ڕێوە..؟؟؟

## سەرپێچی کردنی خودا؟؟؟؟




پیاوێك هات بۆلای ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم.... گووتی:

ئەی شێخ... گیان ودەروونم... پالم پێوەدەنێن بۆ سەرپێچی کردن و گوناح.... ئامۆژگاریم بکە!

ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم پێی وت:

ئەگەر گیان و دەروونت پاڵیان پێوەنایت بۆ سەرپێچی کردنی خودا...گوێ مەدەیە..

بەڵام پێنج مەرجم هەیە بۆت

پیاوەکە وتی : پێم بڵێ!

ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم وتی:

ئەگەر ویستت سەرپێچی خودا بکەیت لە شوێنێك خوت بشارەوە کە خودا لەو شوێنەدا نەت بینێت !

پیاوەکە وتی:

پاك و بێگەردی بۆ خودا...چۆن دەتوانم خۆمی لێ بشارمەوە... کە هیچ شتێکی لێ ون نابێت!

ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم وتی:

پاك و بێگەردی بۆ خودا...ئایا شەرم ناکەیت سەرپێچی خودا بکەیت کە دەشزانی دەت

بێنێت... پیاوەکە بێدەنگ بوو...

پاشان وتی: زیاتر ئامۆژگاریم بکە!

ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم وتی:

ئەگەر ویستت سەرپێچی خودا بکەیت... سەر پێچی لەسەر زەوی ئەودامەکە

پیاوەکە وتی:

پاك و بێگەردی بۆ خودا...بۆ کوێ بڕۆم... هەرچی لە سەر زەوی یە موڵکی ئەوە!

ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم وتی:

.ئایا شەرم ناکەیت سەرپێچی خودا بکەیت.... کەچی لەسەر زەوی ئەویش نیشتە جێی؟

پیاوەکە وتی: زیاتر ئامۆژگاریم بکە!

ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم وتی:

ئەگەر ویستت سەرپێچی خودا بکەیت... لە ڕزق و ڕۆزی ئەو مەخۆ

پیاوەکە وتی:

پاك و بێگەردی بۆ خودا... ئەی چۆن بژیم... هەموو نیعمەتەکان هی ئەون!

ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم وتی:

ئایا شەرم ناکەیت سەرپێچی خودا بکەیت....کەچی لە ڕزق و ڕۆزی ئەو دەخۆی و دە خۆیەوە و... ڕزقیشت لای ئەو پارێزراوە؟

پیاوەکە وتی: زیاتر ئامۆژگاریم بکە!

ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم وتی:

ئەگەر سەرپێچی خودات کرد... پاشان مەلائیکەتەکانی خودا هاتن بەرەو دۆزەخت بەرن... لە گەڵیاندا مەچۆ بۆ دۆزەخ!!

پیاوەکە وتی:

پاك و بێگەردی بۆ خودا... ئایا من توانای ئەوانم هەیە... بەڵکو بەپاڵدان دەم بەن بەرەو دۆزەخ!!!!!

ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم وتی:

هەر کاتێك نامەی کـردەوە خراپـەکانت بـۆ خوێندرایـەوە.... لاملـی بکـە کـەتۆ نـەت کردوون!

پیاوەکە وتی:

پاك و بێگـەردی بـۆ خـودا...ئـەی ڕێـز لـێگیراوە نووسـەرەکان ( کـرام الکـاتبون) لـە کوێن...مەلائیکە پارێزەکان ( الملائكه الحافظون) لـە کـوێن...شـاهیدە قـسە پێکراوەکـان ( الـشهود الناگقون) لە کوێن)

دواتر پیاوەکە دەستی کرد بە گریان و.... ڕۆیشت.... بەدەم ڕۆیشتنەوە هەر دەی وت:

ئەی ڕێز لێگیراوە نووسـەرەکان ( کـرام الکـاتبون) لـە کـوێن...مەلائیکـە پارێزەکـان ( الملائكه الحافظون) لە کوێن...شاهیدە قـسە پێکراوەکان ( الـشهود النـاگقون) لـە کوێن)!!!!!

# چرکەیەك بە یارمەتی خۆت!



لەو چەند چرکە کەمەی کە ئەم چیرۆکەیەت تێدا خوێندەوە چەندەها کەس لەم کاتەیەدا مردن!!

بەداخەوە کەهەندێکیان لەسەر سەرپێچی کردنی خودا مردن پەنا بە خودا!!!!

تۆ چووزانی کە ناوی تۆش لەناو ئەواندانیە!

بەبیر خۆتی بێنەوە!

ئەوکەسەی کە پێش چەند چرکەیەك مرد !

هەمان گوومانی تۆی بە خۆی دەبرد و بە خۆی دە وت!...

(( کاتم زۆر لە بەردەمدا ماوە))!!!!!

وَلَن يُؤَخِّرَ اللَّهُ نَفْسًا إِذَا جَاءَ أَجَلُهَا ۚ وَاللَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١١﴾ سورە المنافقون

واتە: جا ئەو داخوازیە بەجێ نیە، چونکە ڕۆژی هەرکەسێك تەواو بوو، کاتی مەرگی هەر کەسێك هات، هەرگیز خوا دوای ناخات و مۆڵەتی بۆ تازە ناکاتەوە، خوایش زۆر ئاگایە بە هەموو ئەو کاروکردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن هیچ دواناکەێت!!!!

کەواتە لە گەڕانەوت بۆ لای ئەو دوامەکەوە!

(( لَا إِلَٰهَ إِلَّا أَنتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ الظَّالِمِينَ ٨٧ ))!!

واتە : **پەروەردگارا هیچ خوایەک نیە جگە لە تۆ، پاکی و بێگەردی هەر بۆ تۆیە، بەڕاستی من لە ستەمکاران بووم (کاتێک بە بێ فەرمانی تۆ قەومەکەم بەجێهێشت).**

خودایە بەناوە پیرۆزەکانت لێت دەپاڕێینەوە سەرەنجامان بەخێر بگێڕە (( اللـهم ارزقنا حسن الخاتمة)) امین.

# سەرگوزەشتەی هەڵۆیەك



دەگێڕنەوە هەڵۆیەك لە یەكێك لە چیاكاندا دەژیا و هێلانەی لەسەر چڵی دارێكی بەرز دروست كرد بوو،هێلانەی هەڵۆكە چوار هێلكەی تێدا بوو، دوای ڕوودانی زەمین لەرزەیەكی توند یەكێك لە هێلكەكانی هەڵۆكە كەوتەخوارەوە و تلبوەوە تاوەكو لەناو كولانەی مریشكێك گیرسایەوە،هەر بۆیە مریشكەكە وای هەست كرد پێویستە لەسەری هێلكەی هەڵۆكە بپارێزێت و ئاگاداری بێت ،بۆیە مریشكە پیرەكە خۆی تەرخان كرد بۆ ئاگادار بوونی هێلكەكە هەتاوەكو هەڵی هێنا، ڕۆژێكیان هێلكەكەی هەڵ هێناو هەڵۆیەكی بچوكی جوانی لێ هاتە دەرەوە،بەڵام ئەم هەڵۆیە هەرلەسەرەتاوە وا پەروەردەكرا كە ئەو مریشكە، هاتا وای لێهات وای دەزانی كە ئەو تەنها مریشكە و بەس،ڕۆژێكیان كە لە كولانەی مریشكەكە یاری دەكرد كۆمەڵێك هەڵۆی بینی بەبەرزی ئاسمان دەفڕین، بۆیە ئەو هەڵۆیە ئاواتی دە خواست توانیبای ئەویش وەك ئەو هەڵۆیانە بە ئاسماندا فڕی بوایە، بەڵام بە پێكەنینێكی گاڵتە جاڕی یەوە لەلای مریشكەكان پێشوازی لێ كرا و پێیان وت: تۆ تە نها مریشكێكی و ناتوانیت بە ئاسماندا بفڕیت وەك ئەو هە ڵۆیانە، بۆیە دوای ئەو جارە هەڵۆكە وازی لە خەوی فڕین بە ئاسماندا هێنا، و ئازاری ئائومێدی ڕوی تێكرد هەر بۆیە ژیانێكی درێژی بەسەر برد وەكو مریشك..!

سەرنج و تێبینی لەم سەرگوزشتەیە:

تۆ ئەگەر پاڵ بدەیتە ژیانی نەرێنیت دەبیتە کۆیلەی ئەو بیرو ڕایەی باوەڕت پێ یەتی،ئەگەر تۆ هەڵۆی و خەوی فڕین دەبینیت و دەتەوێت بەبەرزی ئاسماندا بفڕیت، شوێن خەونـەکانت بکەوە و گوێ بە قسەی مریـشکەکان مـەدە ( ئەوکەسـانەی چـوار دەورەت کـە خـەون و ئاواتەکانت نزم دەکەن!)

چونکە هێز و توانای بەدەستهێنانی ئەوەت تێدایە پاش ویستی خودا.

بۆیە بزانە تێڕوانینت بۆ خۆت و ئاواتەکانت ئـەوان سـەرکەوتنت لـە ژێرکـەوتن دیـاری دەکەن !

بۆیە هەوڵ بدە خۆت گران بکەیت، و ڕێزی خـۆت بەرزبکەیتـەوە لـە بەرچـاوی خـۆت هەرئـەوەش هۆکـاری سـەرکەوتنە، و هـاوڕێ یـەتی ئەوکەسـانەش بکـە کـە ورەت بـەرز دەکەنەوە.

# شەپقەی پیاوە زاناکە....



دەگێڕنەوە جارێکیان زانایەك بە ڕێگایەکدا دەڕوات،لە ناکاودا دزێك دەست بۆ شەپقەکەی دەبات، و شەپقەکەی سەری لێ دەدزێت،و وەك ڕەشەبا ڕادەکات، زانا کە هیچی بۆ نەکرا تەنها ئەوە نەبێت بە دوای دزە کە کەوت، دەی وت: پێشکەشم کردیت، بڵێ قبوڵم کرد، پێشکەشم کردیت بڵێ قبوڵم کرد................زاناکە هەستی بەوە کرد کە پێویستی یەکی زۆر وای لەو کەسە کردوە کە تاوانێکی وابکات و کڵاوەکەی لێ بدزێت کە نرخەکەی نەی دەکردە پێنج درهەم، بۆیە زاناکە دڵی بە دزەکە سوتا و ویستی تێ ی بگەیەنێت کە کڵاوەکە وەك دیاری یەك قبوڵ بکات، بۆ ئەوەی هەست بە نائارامی دەروون و ویژدان نەکات..........

ئێمە ئێستا زۆر پێویستمان بەبیرکردنەوەیەکی وەك ئەو زانایە هەیە، پێویستمان بەو شێوە دڵ نەرمی و سوز و بەزەی یە هەیە.......چونکە زۆر ئەو هەڵە و کەم و کورتیانەی لێرە و لە وێ ڕوودەدەن لە کەسانی خراپ و دڕندەوە ڕوونادەن، بەڵکو لەکەسانێك ڕوو دەدەن

کە بە بارووددۆخێکی شلۆق و نا خۆشدا تێدەپەڕن،و ملکەچی ئەو بارووددۆخە دەبێت، و بیر و هۆش و ڕاستی لەدەستدەدات، و لەکەسانێکەوە ڕوودەدات کە بە هەڵوێستێکی لاواز دا تێدەپەڕێت بەرامبەر لایەنە ورووژێنەرەکان، خەڵکانیش بە هەڵە لەو بارو دۆخە دەگەن، بۆیە ڕەوشتیان تێکچووە، و هەڵوێستیان گۆڕاوە..........بۆیە پێویستە لاپەرەیەکی نوێ هەڵدەینەوە. زۆر ئاسانە خەڵکی تاوانبار کەین، و گومانی خراپ بەرین و لۆمەی بکەین و سزای بدەین، بەلام زۆر گرانە لە هۆکارە ڕەوشتی یە خراپەکان بگەین، زۆر گرانە داوای لێ بووردن بکەین، و شت لەبیر بەرینەوە، ولاپەرەیەکی نوێ هەڵ دەینەوە، چونکە ئەو کارانە پێویستیان بە ڕوونی و نەرمی و داهێنان هەیە.

چەندە جوانە هەریەکێك لە ئێمە خۆمان یەك لابکەینەوە بە گیانی ئەو زانایە و لێبوردەییە بۆ ئەوەی لە ناخاندا ماناکانی لێبووردەیی و بەزەیی و............ئێمە کاتێك تووشی هەڵەیەکی گەورە دەبین چاوەڕوانی کەسانێك دەکەین کە پاساومان بۆ بێنەوە و هۆکارەکانی تووش بوونمان بەهەڵەکان قبوڵ بکەن.....

# گفتوگۆیەكی شەیدایانە



شێتێك بەلای عابیدێكدا تێپەڕ بوو كە هاواری دەكردە خودا و بە كوڵ دەگریا و فرمێسك بە خوڕ بە سەر گۆنا كانیدا دەهاتنە خوارەوە و دەیگوت:

پەروەردگارا نەم خەیتە ناو ئاگری دۆزەخ و بم بەخشە و بەزەیت پێمدا بێتەوە.

ئەی بەخشندەی میهرەبان بەئاگر سزام نەدەیت.

من زۆر بێ هێزم و توانای ئارام گرتنی ئاگرم نی یە بە زەیت پێم دابێ.

ئێسكەكانم زۆر باریكەو هێزی خۆ پاراستنی تینی ئاگری نی یە بەزەیت پێم دابێ.

شێتەكە بەدەنگێكی بەرز پێكەنی ؟

عابیدەكە ئاوڕی بەلایدا دایەوەو وتی:

چ شتێك وات لێ دەكات پێ بكەنی ئەی شێت؟؟

شێتەكە وتی: قسەكانی تۆ وام لێ دەكات پێبكەنم!

عابیدەكە وتی: چ شتێك لە قسەكانم وات لێ دەكات پێبكەنی؟؟

شتێتەكە وتی: چونكە تۆ لەترسی ئاگر دەگری؟

عابیدەكە وتی:بۆ تۆ لەئاگر نا ترسی؟؟

شتێتەکە وتی: نەخێر. نەخێر ناترسم لە ئاگر.

عابیدەکە دەستی کرد بە پێکەنین و وتی: بەڕاستی تۆ شێتی.

شتێتەکە وتی: ئەی عابید تۆ چۆن لە ئاگر دەترسی کە خودایەکی وات هەبێت بەزەیەکەی هەموو شتێکی داپۆشیوە؟

عابیدەکە وتی: من تاوانی وام هەیە ئەگەر خودا بە دادگەری خۆیم لەگەڵمدا بکات ئەوا دەمخاتە دۆزەخەوە، بۆیە دەگریم بۆئەوەی خودا بەزەیی پێمدابێتەوە و لە تاوانەکانم خۆش بێت و بەدادگەری خۆی دادگایم نەکات ، بەڵکو بە چاکەو بەزەیی و میهرەبانی خۆی لەگەڵم دا بکات بۆ ئەوەی نەچمە ئاگرەوە؟؟

ئەوجارە شێتەکە زۆر لە جاری پێشووتر بە هێزتر دایە قاقای پێکەنین.

عابیدەکە زۆر بێتاقەت بوو و گوتی: چ شتێك وات لێ دەکات ئاوا پێبکەنی؟؟

شتێتەکە وتی: ئەی عابید تۆ خودایەکی دادگەرت هەیە و ستەم لەکەس ناکات، تۆ لە دادگەریەکەی دەترسی؟ تۆ خودایەکی چاو پۆشی کار و بەخشندەو تۆبە وەرگرت هەبێت لە ئاگرەکەی دەترسی؟؟ عابیدەکە وتی: ئایا تۆ لە خودا ناترسی ئەی شێت؟

شتێتەکە وتی: بەڵێ، من لە خودا دەترسم، بەڵام ترسەکەم لە ئاگرەکەی نی یە......

عابیدەکە بە سەرسوڕمانەوە وتی: ئەگەر ترست لە ئاگرەکەی نی یە ئەی لە چی دەترسی؟؟

شتێتەکە وتی: من لە ڕوو بە ڕووبوونەوەی خودا و پرسیار کردنەکەی دەترسم کە پێم بڵێ: بە ندەکەم بۆچی سەر پێچیت کردم؟؟

ئەگەر من لە خەڵکی دۆزەخ و ئاگر بم داواکارم بم خاتە ناو ئاگر بێ ئەوەی پرسیارم لێ بکات، چونکە سزای ئاگرم لا خۆشترە لە پرسیار کردنی خودای پاك و تاك!

چونکە من توانای تەماشای کردنیم نی یە بە چاوێکی ناپاك و قسەیەکی درۆزنانە.....

ئەگەر چوونە ناو ئاگر خۆشەویستم ڕازی بکات گوێنم لێ نیە!

عابیدەکە لە قسەکانی شتێتەکە سەری سوڕما و دە ستی کرد بە بیر کردنەوە لێ یان.

شتێتەکە وتی: ئەی عابید نهێنی یەکت پێ دەڵێم لای کەس باسی مەکە.

عابیدەکە وتی: ئەو نهێنی یە چی یە ئەی شێتە ژیرەکە؟

شێتەکە وتی: ئەی عابید خودای من نام خاتە ناو ئاگر دەزانی بۆچی؟؟

عابیدەکە وتی: بۆچی ئەی شێت؟

شێتەکە وتی: چونکە من بە خۆشەویستی و ئامەزرۆیی خودام پەرستووە، بەلاَم تۆ لە ترس و ئومێدەوە پەرستووتە... بۆیە گومانی من لە گومانی تۆ باشترە و داواکاری من باشترە لە داواکاری تۆ، بۆیە ئەی عابید ـ خۆ ئامادەکردنت بۆ ئەو شتەی کە هیوای بۆ نا خوازی باشترە لەوەی کە هیوات پێیەتی.

چونکە حەزرەتی مووسا( سەلامی خوای لەسەر بێت)ە چوو بۆ هێنانی پشکۆ ئاگرێك بۆ ئەوەی خۆیی و خانەوادەی پێ گەرم بکاتەوە،بە پێغەمبەرایەتی گەڕایەوە......

منیش ڕۆیشتم بۆ ئەوەی جوانی ڕووی پەروەردگارم ببینم، بەلاَم بە شێتی گەڕامەوە!!

شێتەکە بە پێکە نینەوە ڕۆیشت و عابیدەکەش بە گریان....

بۆیە عابیدەکە دەی وت: باوەڕناکەم ئەوە شێت بێت،ئەوە گەورەترین ژیری نێوان ژیرانە،بەڕاستی من شێتم بۆیە دەبێ وتەکانی بە فرمێسکەکانم بنووس مەوە...

ئەمیری باوەڕداران عومەری کوڕی خەتاب ( ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لەسەربێت) دەی فەرموو: زیاتر هیوادار بە بۆ شتێك که داوای ناکەی و هیوای بۆ نا خوازی لە شتێك کە داوای دەکەیت و هیوای بۆ دەخوازی.

چونکە حەزرەتی مووسا(سەلامی خوای لەسەر بێت) ڕۆیشت پشکۆ ئاگرێك بۆ خالەوادەی بێنێت خودای پەروەردگار گفتوگۆی لە گەڵدا کردو بۆیە بە پێغەمبەری گەڕایەوە....هەروەها پاشای( سەبەء) بەکافری چووە دەرەوە، بەلاَم لەگەڵ حەزرەتی ( سولێمان ) موسڵمان بوو.... هەروەها ساحیرەکانی فیرعەون چوونە دەرەوە داوای شکۆداریان بۆ فیرعەون دەکرد، بەلاَم بە باوەڕداری گەڕانەوە....

پەروەردگارا چۆن لە یادت بکەم،کە هەمیشە لە یادمی؟؟

چۆن سەرپێچیت بکەم، کە تۆ چاودێری کارمی؟؟

# گێلترین منداڵ لە جیهان



منداڵێك چووە ژووری سەرتاشخانەیەك، سەرتاشە کە بە گوێ ی مشتەریەکانیدا چرپاندی سەیری ئەومنداڵە بکەن : ئەوە گێل ترین منداڵە لە جیهاندا ئێستاش ئەمەتان بۆ دەسەلێنم، بۆیە سەرتاشەکە دینارێکی لەناودەستی ڕاستی دا داناو لە ناو دەستی چەپیشی ڕوبعێکی دانا، داوای لە منداڵەکە کرد کە یەکێك لە دووەیان هەڵ بگرێت منداڵەکە ڕوبعەکەی هەڵگرت و ڕۆیشت، سەرتاشەکە بە مشتەریەکانی وت:بینیتان ئەوە هەرگیز فێرنابێت هەمیشە وادەکات ڕوبەعەکە هەڵگرێت.

یەکێك لە مشەریەکان کاتێك لە سەرتاشخانەکە هاتە دەرەوە، منداڵەکەی لای دۆندرمە فرۆشێك بینی بۆیە لێ ی نزیك بووە وە و لێ ی پرسی ئایا بۆ چی ڕوبعەکەت هەڵگرت و دینارەکەت هەڵ نەگرت..؟

منداڵەکە وڵامی دایەوە ئەو ڕۆژەی دینارەکە هەڵبژێرم یاری یەکە کۆتایی پێ دێت..!!

لە گەورەکان شتی زۆر فێر بووم، بەڵام لە بچووکەکان شتی زۆر تر فێر بووم..؟

پێویستە بنچینەی یاری کردن فێر ببی، دواتر پێویستە لەسەرت جوانتر یاری بکەی لەئەوانی تر.(ئەنشتاین)

# عەیبەکانی خۆت چاك بکە




پیاوێك لەگەڵ خێزانەکەی چونە خانوە تازەکەیان،لە بەرەبەیانی یەکەم ڕۆژیان کە خەریکی نان خواردنی بەیانی بوون، خێزانەکە بە پیاوەکەی وت بەئاماژەکردنی بۆ پەنجەرەی ماڵەکەیان کەدەی ڕوانی یە باخچەی نێوان خۆیان و دراوسێکەیاندا: تەماشاکە خۆشەویستەکەم،تەماشاکە جلە شۆراوەکانی دراوسێکەمان باش نە شۆردراون و پاك نەکراونەتەوە...لەوانەیە سابوونی هەرزان و خراپیان کڕیبێت....هەموو جارێك ژنەکە هەمان توانجی لە دراوسێکەیان دەگرت کە جلە شۆراوەکانی دەبینی،پاش یەك مانگ ژنەکە سەری سوڕما کە جلە شۆراوەکانی بینی بەسەر پەتی جل شۆردن هەڵواسراون بەڵام ئەمجارە زۆر پاك و خاوێنن، بۆیە بانگی پیاوەکەی کردو پێی وت: تەماشاکە پیاوەکە...لە کۆتاییدا دراوسێ کەمان فێر بوو کە چۆن جل بشۆرێت...

پیاوەکە وە لامی دایەوە و وتی: خۆشەویستەکەم، وادیارە ئەو ڕۆ زوو هەستاوی و شووشەی پەنجەرەکەت پاك کردۆتەوە کەلەوێوە سەیری ماڵی دراوسێکەمانت دەکرد...!!

پەند لەم چیرۆكە:

عەیبەكانی خۆت چاك بكە پێش ئەوەی سەیری عەیبی خەڵكی تر بكەیت.

مرۆڤ پووشكە لە چاوی خەڵكی دا دەبینێت بەڵام كاریتە(داری گەورە) لە چـاوی خۆیـدا نابینێت.

# کێ دەتوانێت مریشکەکە لە شووشەکە دەربهێنێت..؟



دەگێڕنەوە ڕۆژێك لە ڕۆژان مامۆستای زمانی ئینگلیزی وانەی بە قوتابیەکانی دەوت پێش هاتنی تاقی کردنەوەی کۆتایی ساڵ بەچەند هەفتەیەك!!

لەکاتی وتنەوەی وانەکە یەکێك لە قوتابیەکان وانەکەی پێ بڕی و وتی: مامۆستا...زمانی ئینگلیزی وانەیەکی زۆر گرانە؟؟!

ئەو قوتابی یە قسەکانی تەواو نەکرد سەرجەم قوتابی یەکان هەمان قسەیان دووبارەکردەوە و بوون بەیەك حزبی بەرهەڵستکار بەرامبەر مامۆستا!!

بەو شێوەیە یەکێك قسەی دەکرد و یەکێك هاواری لێ هەڵسا و یەکێك دەیەوێت کات بە فیڕۆ بدات بەو شێوەیە.....!!

مامۆستاکە کەمێك بێدەنگ بوو دوایی وتی: باشە ئەمڕۆ دەرس نا خوێنین،،دەرسەکە دەکەین بە یاری و مەتەڵ..!!

قوتابی یەکان بە بیستنی ئەم هەواڵە زۆر دڵ خۆش بوون...

بۆیە مامۆستا هەڵسا لەسەر تەختەڕەش بە دروست کردنی وێنەی شووشەیەکی ملەوانە تەسك و باریك..و لەناویشیدا وێنەی مریشکێکی دروست کردو دواتر وتی:کێ دەتوانێت ئەو مریشکە لەناو ئەو شووشەیە دەربهێنێت؟؟؟!!!

بەمەرجێك نە شووشەکە بشکێنێت و نە مریشکەکەش بکوژێت!!!!!

هەوڵی قوتابی یەکان دەستی پێ کرد کە هەرهەموویان بە شکست کۆتاییان پێ دەهات،،
بۆیە یەکێ لە قوتابی یەکان لە کۆتایی پۆلەکەدا هاواری لێ هەڵسا بە نا ئومێدی وتی:مامۆستا ئەو مریشکە لەو شووشە نا هێنەدەرەوە یان بە شکاندنی شوشەکە یان بەکوشتنی مریشکەکە،،
مامۆستاکە وتی: ناتوانین پێشێل کاری مەرجەکانمان بکەین،،
قوتابی یەك بە گاڵتەجاڕی یەوە وتی: کەواتە مامۆستا بەوکەسە بڵێ کە مریشکەکەی خستۆتە ناو شووشەکە با هەر خۆشی بیهێنێتەدەرەوە کە چۆن خستۆتیە ناوەوە،،،
سەرجەم قوتابی یەکان دەستیان کرد بە پێکەنین،،، بەڵام پێکەنینەکەیان زۆری نەخایەند!!
تا دەنگی مامۆستا پێکەنینەکەی پێ بڕین و کە گوتی : ڕاست دەکەی ، ڕاست دەکەی،،
ئەوە وەڵامە ڕاستەکەیە!!
کێ مریشکەکەی خستۆتە ناو شووشەکە هەرخۆشی دەتوانێت بیهێنێتەدەرەوە.. هەروەکو ئێوە!!
دەستەواژەیەکتان خستۆتە ناو مێشکتان کە زمانی ئینگلیزی وانەیەکی زۆر گرانە...
هەربۆیە هەرچەندە من بۆتان شی بکەمەوە و هەوڵ بدەم بۆتان ئاسان بکەم بێگومان سەرکەوتوونابم.. تەنها ئەگەر ئێوە هەوڵ نەدەن ئەم دەستەواژەیە بەبێ یارمەتی هیچ کەسێکی تر لە مێشکتان دەرنەکەن،، کە چۆن هەر بۆ خۆشتان بەبێ یارمەتی هیچ کەسێکی تر داتان ناوە!!
ئەمە چیرۆکی ئەو مامۆستایەیە،،
قوتابی یەکان هەستاون مریشکێکیان خستۆتە ناو شووشەکە،،بەڵام ئایا ئێمە چەندان مریشکمان خستۆتە ناو شوشەوە لە ژیانی خۆمان بەو گومان و دوودڵ یانەوە خەریك کردووە...

# هەڵۆیستە قورسەکان ورەی بەرز بەرهەم دێنن



شارلی شاپلن شانۆکاری بەناوبانگ لە یادەوەریەکانیدا باسی چیرۆکی هاوڕێ یەکی دەکات کە خاوەنی کارگەیەك بووە ، کە سەردانی کرد، بینی وێنەیەکی گەورەی لە نوسینگەکەی داناوە کە لە چوارچێوەیەکی گرانبەها دابوو ئەویش وێنەی پیاوێك بوو کە شێوازو نیشانەی توند و تیژی و لووت بەرزی بوو!!!!

بۆیە پرسیاری لێ کرد: ئایا ئەمە باوکتە؟

وەلامی دایەوە: نەخێر....

ئەوە خاوەنی کارگەیەکی ڕکابەری منە،ژیانی کرداری من وەکو فەرمانبەر لای ئەو دەستی پێ کرد.....تاڵی پی چەشتم!!!!

بۆیە وێنەکەیم لە بەردەمی خۆم داناوە، تاوەکو بیرم خاتەوە ئەگەر بێتو تەمەلی بکەم....ئەوا دەگەڕێمەوە بۆ لای ئەو بۆ کارکردن!!!

ڕووبەری ژاپۆن نزیکەی ١٧٪ ڕووبەری شانشینی عەرەبی سعودیەو ژمارەی دانیشتوانی ژاپۆن نزیکەی ١٣٠ ملیۆن کەسە، کە چڕیەکەی دەگاتە ٣٣٧ کەس بۆ هەر کیلۆ مەتریکی چوارگۆشە. نزیکەی سێ چواریەکی ڕووبەرەکەی دارستانی شاخاوی یە و بۆ کشتوکاڵ ناشێت، بۆیە لە کەنارە ئاوی یەکان دانیشتوان زۆر ترن، لێرەوە ماسی دەبێتە خواردنی سەرەکی لە ژاپۆن.

بۆ زانینی ڕادەی گرنگی دانی ژاپۆنی یەکان بە ماسی نزیکەی چل گۆڤاری زانستی ژمێردراون ( کە زۆربەیان بە زمانی ژاپۆنین) لێکۆڵینەوە دەربارەی ماسی و سامانی ماسی بڵاودەکەنەوە.هیچ زانکۆیەك لە ژاپۆن کۆلیجێك یان بەشێکی تێدا نی یە کە لەو بابەتە نە کۆڵێتەوە. بەڵکو زانکۆیەکی تایبەتمەند هەیە بۆ لێکۆڵینەوەی ماسی. سەرەڕای ئەوانەش چەند لایەنێك هەن کە هاوکاری لێکۆڵینەوەکانی ئەو سامانە دەکەن. هیچ جێگەی سەرسامی نییە کە ژاپۆنی یەکان نزیکەی لە ١٥٪ سامانی ماسی لە جیهان دا ڕاودەکەن و بە پلەی دووەم دێن دوای چینی یەکان.

لە ڕێگەی سوپای سەنگافۆری لە تۆڕی ئینتەرنێت ئەم چیرۆکەم دەربارەی ژاپۆنی یەکان و حەزکردنیان لە گۆشتی ماسی تازە خوێندەوە و پێم خۆش بوو بۆ ئێوەشی بگێڕمەوە.

ماوەی دەیان ساڵ بوو ماسی لە کەنارە ئاوی یەکانی ژاپۆن نزیك نەدەبوونەوە.بۆیە ژاپۆنی یەکان هەستان بە چارەسەرکردنی ئەم گیروگرفتە و لە ناوجەرگەی دەریا و ئۆقیانۆسە دوور لە کەنارەکان ڕاوە ماسی یان دەکرد.

لەگەڵ ڕۆژگار بەلەمەکانی ڕاوکردن گەورەتر بوون و زیاتر لە کەنارەکان دوور دەکەوتنەوە، بەڵام ئەمە گەیشتنی ماسی یەکان بۆسەر وشکانی دوادەخات ئەوەش مانای ئەوەیە ماسی یەکە بە تازەیی نامێنێتەوە!

بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە کەشتی یەکان لەگەڵ خۆیان بەفرگر و سەهۆڵگەیان هەڵدەگرت ، کە دەسبەجێ ماسی یەکانیان تێدا دادەنا دوای ڕاوکردنیان.ئەمەش بووە هۆی گەورەبوونی قەبارەی کەشتی یەکان بۆیە زیاتر لە کەنارەکان دوور دەکەوتنەوە،بەمەش ماوەی مانەوەی دوور لە کەنارەکان زیاتر بوو.ئاخۆ لەمەدا کێشەیەك هەیە؟

بەڵێ! ئێستاکە ماسی یەکە تازە نی یە! چونکە خراوەتە ناو بەفرگرەوە و سەهۆڵگەوە، خەڵکی بە شێوەیەك تەماشای ماسی یەکان دەکەن کە بەستراوە و تازە نی یە! بۆیە نرخی ماسی یەکان دابەزی کە بەم جۆرە ڕاودەکران و دەخرانە سەهۆڵگەوە! کێشەکە لەوەدا چی یە؟ کێشەکە ڕوون و ئاشکرایە، نرخی کەم دەبێتە هۆی ئەوەی ماسی زیاتر هاوردەی بازاڕ

نەکرێت! ئەی چارە چی یە؟

ژاپۆنی یەکان هەردەم چارەسەریان بێ یە! هەستان بە هەڵگرتنی حەوزی گەورەی پڕ ئـاو لە ناو کەشتی یـەکانی ڕاوکردن،ماسـی یـەکانیان تێـدا دەنـا، بـە زینـدوویی دەمانـەوە تـا دەگەیشـتنە کەنار ئەوسا دەریان دەهێنن بۆ فرۆشتن! بێ گومان ئەمە بیرۆکەیەکی زیرەکانەیـە، بەڵام دوای ئەوە چی ڕووی دا؟ بۆیان دەرکەوت کاتێك ماسی یەکان دەگەنە کەنار هەسـت بە تەمبەڵی و سستی دەکەن! چونکە ماسی یەکان لە ناو حەوزەکـە قـەرە باڵغیـان دروسـت کردووە و وەکو لە ناو دەریا جم و جۆڵ دەکەن لەوێدا نا جوڵێنەوە بەم شێوەیە! بەم پێ یـە تام و چێژی ئەم ماسی یانە جیاواز دەبێت لە تام و چێژی ماسی تازە ڕاو کراو!ئـەو ژاپۆنیانـە چین؟ ئەوانە هیچ سەرسام نابن و هەروەکو پەندەکە دەڵێت ( دەتوانن لە مانگی ڕەجـەب بـە ڕۆژووبن).چۆن ڕاوچیەکان دەتـوانن ڕازی یـان بکـەن؟ ڕێگـە چـارە هەمیـشە لای ژاپـۆنی یەکانە.هەستان بە دانانی بەچکەی بچوکی ماسی قرش لە ناو حەوزەکە! بۆ چی؟ بـۆ ئـەوەی ماسی یەکان لەناو حەوزەکە لە جوڵە نەوەستن و هەردەم لە ماسی یە قرشەکان ڕابکەن.!

پەند و ئامۆژگاری لەم چیرۆکە ئەوەیە ئەو بەرەنگاری یەی ماسی یەکەی تێـدا دانـرا وای کرد هەمیشە بجوڵێتەوە و بە خێرایی ڕابکات لە پێنـاو مانـەوەی لـە ژیانـدا! ڕاوچـیەکانیش ئەوەیان دەویست کاتێك دەگەیشتنە کەنار ماسی یەکان تازە و زینـدو بـن و تـام و چـێژیان خۆش بێت ، چونکە بە ڕاستی ئەوانە ماسی تازەن! و بێ گومان قرشەکان هەندێ لـە ماسـی یەکان دەخۆن بەڵام ئەوەی دەخورێ ڕێژەیەکی کەمە کە شایانی باس نی یە.

ئاخۆ ئەو سستی و تەمبەڵی یەی دووچاری ماسی یەکان بووە لە ناو حەوزەکە دا تووشی ئێمەش بووە، ئێمەی مرۆڤ، کاتێك لەبەردەم بەرەنگاری یەکان دا ناژین؟ ئایا ئەو بەرەنگاری یانەی ڕووبە ڕوومان دەبنەوە وامان لێ دەکەن لە کارەکانماندا چالاك بـین؟ ئایـا بـەرەنگاری یەکان لە چالاکی بەردەوام دەمان هێڵنەوە؟

بی گومان سەرکەوتن لە ژیانی سووك و سانا نایەتەدی کـە بـەرەنگاری تێـا نـی یـە! بـا هەموو ئەو شارەزایی و هێز و توانا و سەرچاوانەی خوای گەورە پی ی بە خشیوین بەکاریان

بهێنین تاوەکو  کارێکی جیاواز بکەین لەوەی سـت و تەمبەڵەکان ئەنجامی دەدەن.

با هەر یەکێ لە ئێمە بەچکە ماسی قرش لە دوای خۆی دابنێ.....ئینجا تەماشـابکات  تـا چ ئاستێك بەرەو پێش دەچێت لەم ژیانە دا.....

هەر بۆیە هەڵوێستی قوورس ورە بەرزی پەیدا دەکات

# کاسەی شێتی ...



دەگێڕنەوە جارێکیان نە خۆشی شێت بوون کەوتە نێو ڕووباری لای چەپی شارێك....هەر کاتێك کەسێکی ئەم شارە لەو ئاوەی خواردبواوە ئەوا تووشی شێتی دەبوو....دواتر ئەوانەی شێت دەبوون کۆدەبوونەوە بە زمانێك لە نێوان خۆیاندا گفتوگۆیان دەکرد کە کەسە ژیرەکان لێیان تێنەدەگەیشتن.....پاشای شار دەستی کرد بە بەرپەرچ دانەوەی تاعون و جەنگان دژی نەخۆشی شێتی.....

هەتا بەیانیەکیان پاشا لە خەو هەڵسا بینی شاژنیش شێت بووە....شا ژن لەگەڵ سێ یەکی خەڵکی شێت بوو کۆبوونەوەی دەکرد و باسی شێت بوونی پاشای بۆ دەکردن...!

ڕۆژێکیان پاشا بانگی وەزیری کرد و وتی: ئەی وەزیر شاژنیش شێت بووە ئەی پاسەوانەکان لە کوێ بوون؟

وەزیر وتی: گەورەم پاسەوانەکانیش شێت بوونە!

پاشا وتی: کەواتە هەر ئێستا پزیشکم بۆ بانگ بکە؟

وەزیر وتی: گەورەم پزیشکیش شێت بووە..!

پاشا وتی: ئەم بەڵایە چی یە، ئەی کێ ماوە لە شارەکەم شێت نە بوو بێت..؟

وەزیر وەڵامی دایەوە: بە داخەوە گەورەم لەم شارەدا کەسێك نەماوە جگە لە من و تۆ کە شێت نە بوو بێت..!!

پاشا وتی: ئای خوایە گیان ئێستا من فەرمان ڕەوایی شێت بووەکان دەکەم..!

وەزیر وتی:داوای لێبووردنت لێ دەکەم گەورەم، ئێستا شێتەکان پڕوپاگەندەی ئەوەدەکەن کە ئەوان ژیرن و کەسێکی شێت لەو شارە شك نابەن جگە لە من و تۆ..!

پاشا وتی: ئەم قسە پڕو پوچانە چین! ئەوان لە ئاوی ڕووبارەکەیان خواردۆتەوە و دواجار ئەوان تووشی شێتی بوونە..!

وەزیر وتی: لەڕاستیدا گەورەم ئەوان دەڵێن ئەوان بۆیە ئاوی ڕووبارەکەیان خواردۆتەوە بۆ ئەوەی لە نە خۆشی شێتی دوور بکەونەوە،لە بەر ئەوە بە قسەی ئەوان ئێمە ئێستا شێتین لە بەر ئەوەی لە ئاوی ڕووبارەکەمان نە خواردۆتەوە..! لە بەر ئەوە گەورەم ئێمە ئێستا بەرامبەر ئەوان تەنها وەکو دەنکە خۆڵێکین...ئەوان زۆرینەن....هەرئەوان ئێستا خاوەن حەق و دادگەری و چاکەکارین....هەر بۆیە ئەوان ئێستا دەتوانن دەست نیشانی نێوان ژیر و شێت بکەن....!!!

لێرەدا پاشا وتی: کەواتە ئەی وەزیر هەستە بڕۆ هەرئێستا کاسەیەکی پڕم لە ئاوی ڕووباری شێتی بۆ بێنە...چونکە ئەمە پێویستە ئەگەر بتەوێت بە عاقڵی بمێنیتەوە لە جیهانی شێتەکاندا.

بەڕاستی هەڵبژاردنێکی سەختە....کە خاوەنی بیر و بۆ چونێك بیت لەگەڵ بیر و بۆ چوونی سەرجەمی خەڵك جیاواز بێت...کاتێك ئاسمانی ئاواتەکانت زۆر بەرزتر بێت لەو ڕاستی یەی چوار دەورت....ئایا خۆت دەدەیتە دەست خەڵك....ئایا مل کەچی دەوروبەر دەبیت....لە کاسەکە دە خۆیتەوە....؟؟

ئایا هیچ جارێك پێیان وتووی: ئایا دەکرێت فلان و فلان و فلان هەموویان لەسەر هەڵە بن تەنها تۆ لەسەر ڕاستی بیت..! ئەگەر ئەو قسانەت ئاڕاستە کران باش بزانە ئەوا پێشنیازی ئەوەیان بۆت کردوە کە لە کاسەکە بخۆیتەوە...!

ئایا کاتێك دە چیتە ناو کارێك بە هەموو هیوا و ئاوات و توانایەك و داهێنانێك بەڵام

برادەرێکت دەبینیت کە تازە هاتوە و بەداهێنانێکی کەم بەڵام زوو پێش تۆ دەکەوێتەوە و کەچی تۆ هەر لە شوێنی خۆتی....ئایا هیوا و ئاواتەکانت دەوەستێت.... ئایا داهێنانەکانت کەم دەبێتەوە.... ئایا لە کاسەکە دە خزێتەوە..؟

## شانازی بەکوڕەکەت بکە...!!!!!



هەموو ڕۆژانی هەینی دوای نوێژی هەینی، مامۆستای مزگەوت و کوڕە یانزە ساڵانەکەی کردبوویانە پیشەی خۆیان بەناویەکێك لە گەڕەکەکانی شارەکەیان ( ئەمستردام ) دا دەگەڕان، بۆ دابەشکردنی کتێب و نامیلکەی ئیسلامی بەناوی ( ڕێگای چوونە بەهەشت ) و چەندان ناونیشانی تر بەسەر خەڵکدا.

ڕۆژێك لە دوای نوێژی نیوەڕۆی ڕۆژی هەینی، کاتی ئەوە هاتبوو کە مامۆستاو کوڕەکەی دابەزن بۆ دابەشکردنی نامیلکەکان،بەڵام ئەم ڕۆژە ئاو و هەوا زۆر سارد بوو لەدەرەوە، جگە لە بارینی بارانی بەلێزمە، کوڕەکە جل و بەرگێکی زۆری لەبەر کردبوو بۆ ئەوەی هەست بە سەرمانەکات.

بەباوکی وت : باشە باوکە من ئامادەم!

باوکی پرسیاری لێکرد: بۆ کوێ؟

کوڕەکە وەڵامی دایەوە: باوکە، ئێستا کاتی ئەوە هاتووە بۆ ئەوەی بچینە دەرەوە بۆ دابەشکردنی نامیلکە ئیسلامیەکان.

باوکی وەڵامی دایەوە: ئاو و هەوا زۆر ساردە و بارانێکی زۆریش دەبارێت.

کوڕەکەباوکی تووشی شۆك کرد بەوەڵامەکەی وتی: بەڵام باوکی شیرینم تاوەکو ئێستاش

خەڵکانێك هەن بەرەو دۆزەخ دەڕۆن لەگەڵ ئەوەیش کە باران دەبارێت!

باوکی وەڵامی دایەوە، بەڵام من ناتوانم لەو کەش و هەوا ساردە بێمە دەرەوە.

کوڕەکە وتی: ئایا باوکە، من دەتوانم، بەیارمەتی خۆت بچم بۆ دابەشکردنی نامیلکەکان.

باوکی خێرا وەڵامی دایەوە: بەڵێ دەتوانی تۆ بچی، هەندێك نامیلکەی دایە دەستی.

کوڕەکە وتی : زۆر سوپاس باوکی شیرینم!

لەگەڵ ئەوەشدا تەمەنی کوڕەکە تەنها یانزە ساڵان بوو، کەچی دەستی کرد بە گەڕان بە شەقامەکانی شاری ( ئەمستردام ) بەو تا و و هەوا ساردە و باراناویە، بۆ ئەوەی نامیلکەکانی دابەش بکات بەسەر ئەو کەسانەی پێیاندەگات، دەستی کرد بەدابەشکردن نامیلکە ئیسلامیەکان لە و ماڵ بۆ ئەو ماڵ بۆ دابەشکردنی.

پاش دوو کاتژمێر هات و چۆ لەژێر باران و سەرمادا، تەنها یەك نامیلکەم لامابوو ئەوانی تری گشتی دابەشکردبوو، بۆیە چاوی بە نێوان هاتو چۆکاراندا دەگێڕا بۆ پێدانی کۆتا نامیلکە و گەڕانەوەی بۆ ماڵ،بەڵام شەقامەکان لەبەر ساردی تەواو چۆڵ بوو بوون.

دواتر ڕووی کردەوە بەلای شۆستەی بەرامبەریدا بۆ ئەوەی بچێتە یەکەم ماڵی بەرامبەری بۆ ئەوەی کۆتا نامیلکەی دابەشبکات.

دەستی کرد بە لێدانی زەنگی دەرگاکە، بەڵام کەس وەڵامی نەدایەوە...

دوو بارە و چەند بارە زەنگی دەرگاکەی لێدا، بەڵام کەس وەڵامی نەدایەوە، ویستی دەرگاکە بەجێ بهێڵێت، بەڵام شتێك ڕێگای ڕۆیشتنی پێدەگرت.

جارێکی تر، ڕووی سوڕاندەوە بەرەو دەرگاکە و، دەستی کر بەلێدانی دەرگاکە بە هەموو هێزی خۆی، نەی دەزانی بۆچی ئەو هەموو چاوەڕوانیە دەکات لە بەردەم ئەم ماڵەدا، بەردەوام بوو لەسەر لێدانی دەرگاکە، بەڵام ئەم جارەیان دەرگاکەیان بەهێواشی بەڕوودا کردەوە ؟

ئافرەتێکی بەساڵاچوو لە بەردەمی دەرگاکە وەستا، بەڕوویدا نیشانەی دڵ تەنگی و نا ئومێد یەکی زۆر دیار بوو.

ئافرەتەکە وتی : کوڕە شیرینەکەم دەتەوێ چیت بۆ بکەم؟

کوڕەکە وەڵامی دایەوە بە دووچاوی گەش و دەمێکی بە پێکەنین: خانم گیان، داوای لێبوردنت لێدەکەم ئەگەر نیگەرانم کردبی،بەڵام تەنها دەم ویست پێت بڵێم، بەڕاستی خودا تۆی زۆر خۆش دەوێت و ئاگاداریت دەکات، بۆیە منیش هاتووم تاوەکو کۆتا نامیلکەت بدەمێ کەلام ماوە، ئەم نامیلکەیە هەمووشتێکت دەربارەی پەروەردگارت پێدەڵێت، هەروەها مەبەستی سەرەکی لە دروستکردنی ژیان و مرۆڤ و چۆنیەتی گەیشتن بەلێرازی بوونی خودا.

بۆیە نامیلکەکەی دایە و ویستی بڕوا، ئافرەتەکە ووتی : زۆر سوپاس کوڕەشیرینەکەم و خوا بتپارێزێت و سەرکەوتووت بکات!

لەهەینی داهاتوو ڕێك دوای نوێژی هەینی، مامۆستا وەك پیشەی هەمیشەیی خۆی دەستی کرد بەئامۆژگاری کردنی خەڵك، دوای تەوابوون دەستی کرد بە پرسیار و وەڵام لەگەڵ ئامادەبووان، ئایا کەس پرسیارێکی هەبوو یان کێ دەیەوێت شتێك بڵێت؟

زۆر بە هێواشی و دەنگێکی نزم لە ڕیزەکانی دواوە لە نێوان ئافرەتاندا، دەنگی ئافرەتێك دەبیسترا و دەی وت: ( هیچ کەسێك لەنێوان ئامادەبوانی ئەم مزگەوتەدا من ناناسن، چونکە پێش ئێستا من نە هاتووم بۆ ئێرە،هەروەوەها هەینی ڕابردوو من بێباوەڕ بووم و موسڵمان نە بوو م و بیریشم لە موسڵمان بوون نەدەکردەوە، پێش چەند مانگێك لە مەو بەر مێردەکەم وەفاتی کرد، منی بەتەنیایی بەجێهێشت لەم ژیانەدا...ڕۆژی هەینی ڕابردوو ئاو و هەوا زۆر سارد بووو بارانێکی زۆریش دەباری، بۆیە بڕیارم دا خۆم بکوژم چونکە هیچ هیوا و ئاواتێکم بە ژیان نەمابوو، هەربۆیە هەستام پەتێك و کورسیەکم هێناو بۆ نهۆمی سەرەوەی ماڵەکەم سەرکەوتم،دواتر هەستام بە قایم کردنی پەتەکە لە یەکێك لە شیشەکانی بن میچی ژوورەکە و چوومە سەر کورسیەکە وەستام و سەرەکەی تری پەتەکەشم لە ملی خۆم قایم کرد، من تەنیا بووم و زۆریش خەمناك بووم لە ئان و ساتی خۆ فڕێدان و خۆکوشتنم دا بووم.لە نەکاوێك گوێم لە دەنگی زەنگی دەرگاکەمان بوو، ووتم : چەند ساتێك دەوەستم و وەڵامی نادەمەوە هەرکەسێك بێت دەڕوات پاش کەمێکی تر. چاوەڕوانم کرد و زیاتر

چاوەڕوانم کرد بۆ ئەوەی بڕوات، بەڵام دەنگی زەنگەکە و لێدانی دەرگاکە هەرزیاتر دەبوو.

بەخۆمم وت دەبێ کێبێت لەسەر ڕووی زەوی لەدەرگای من بدات؟ چونکە هیچ کەسێك لەدەرگای من نادات و نایەت بۆ ماڵەکەم بۆ ئەوەی بم بینێت. پەتەکەم لە ملم کردەوە و لەسەر کورسیەکە دابەزیم بۆئەوەی بەرەو دەرگاکەبڕۆم و ببینم کەئەوە کێیە لەدەرگادەدات بەهەموو موکڕی کردنەی و بەبەردەوامی.

کاتێك دەرگاکەم کردەوە باوەڕم بە چاوەکانی خۆم نەدەکرد کوڕێکی بچووك بوو کە چاوەکانی دەدرەوشانەوە و زەردەخەنەی فریشتە ئاسا لە لێوەکانی دەباری، لەمەو بەر کەسێکی ئاوام نەبینیبوو، بەڕاستی ناتوانم باستان بۆ بکەم،ئەوشانەی لەدەمی دەرچوون دڵمی پێکا، ئەودڵەی کەمردبوو دووبارە بازی داوە بۆ ناو ژیان و ئومێدی پێبەخشیم، پێی وتم بە دەنگێکی فریشتە ئاسا، خانم گیان،ئێستا من هاتووم بۆلای تۆ بۆ ئەوەی پێت بڵێم کە بەڕاستی خودا تۆی زۆر خۆش دەوێت و ئاگاداریت دەکات!

دواتر ئەو نامیلکەیەی پێدام کە ئێستا لەلامە بەناوی ( ڕێگای چوونە بەهەشت )،

چۆن ئەو ئەومنداڵە فریشتە ئاسا هات بۆلام جارێکی تر لە بەر چاوم ون بوو و ڕۆیشت بەناو ئەو سەرماو بارانە دا، منیش دەرگاکەم داخست و هەستام بەخوێندنەوەی هەموو وشەکانی نامیلکەکە زۆر بە وردی تێڕامانەوە، دواتر چووم بۆ نهۆمی سەرەوە و دەستم کرد بە لێکردنەوەی پەتەکە و لابردنی کورسیەکە. چوونکە من لەمەو دوا پێویستم پێیان نەماوە.ئێستا دەم بینن، من زۆر ئاسوودەم چوونکە پەروەردگارە ڕاستە قینە تاقەنەکەم دۆزیەوە.لەبەر ئەوەی ناونیشانی دەزگای بڵاو کردنەوەی ئەم نامیلکەیە لە پشتی نامیلکەکە نوسرابوو، بۆیە ویست بۆخۆم بێم، سوپاسی خودا بکەم و دەست خۆشیش لە ئێوەبکەم بۆ ئەم فریشتە بچکۆلانەیە کە لە کاتێکی زۆر گونجاودا هات بۆ لام، لەڕێگای ئەویشەوە گیانی من ڕزگاری بوو لە مانەوەی هەتا هەتایی لە دۆزەخ).

هیچ چاوێك نەبوو لەناو مزگەوتەکەدا فرمێسکی بە خوڕ لێنەیەتە خوارەوە، دەنگی ( اللە اکبر...اللە اکبر...) بەرز بووە لەمزگەوتەکە،

مامۆستاکە لەسەر دوانگەکەی دابەزی و ڕوی لە ریزی یەکەمی نویژ خوێنان کرد کە کوڕە بچکۆلانە فریشتە ئاساکەی دانیشتبوو....

کوڕەکەی توووند لەباوەشی گرت و دەستی بەگریان کرد لە بەر چاوی خەلکدا بە بێ گوێدان، لەوانەیە لەناو ئامادەبوان هیچ باوکێکی تری تێدا نەبووبێ بە شێوەی ئەو باوکە کەوا شانازی بە کوڕەکەیەوە بکات....

# لە دنیادا وەکو هەژار یاخود ڕێبوار بژی



لە دێر زەمانەوە شارێك هەبوو پاشایەك فەرمان ڕەوایی دەکرد،خەڵکی ئەم شارە پاشایان وا هەڵدەبژارد کە تەنها بۆ ماوەی یەك ساڵ فەرمان ڕەوایەتیان بکات، و دوای ئەوە پاشایان دەنارد بۆ دوورگەیەك بۆ ئەوەی ئەوتەمەنەی کەماویەتی لەوێدا بەسەری بەرێت و دواتر خەڵکەکە پاشایەکی تریان بۆ خۆیان دەست نیشان دەکرد بەم شێوەیە.

یەکێك لە پاشاکانیان کۆتایی بە فەرمان ڕەوایەتیەکەی هات بۆیە خەڵکەکە هەستان بە ڕێ و ڕەسمی کۆتایی هاتنی فەرمان ڕەوایەتیەکەی و جلێکی گرانبەهایان لەبەرکرد و سواری فیلێکی گەورەیان کرد هەستان بەگێڕانی بە چوار دەورەی شارەکەیان بۆ ئەوەی خواحافیزی لێ بکەن.....هەر بۆیە ئەم چەند ساتە لە ناخۆشترین ساتەکانی پاشا و پاشاکانی پێش خۆی بوو.دواتر سواری کەشتیەکی تایبەتیان دەکرد کە بۆ ئەو مەبەستە ئامادەکرابوو بۆ بردنی بۆ ئەو دوورگەیە دوورە بۆ ئەوەی ئەم ژیانەی کەماویەتی تیایدا بگوزەرێنێت.

دوای گەڕانەوەی کەشتی یەکە بۆ شارەکەیان....لە ڕێگای گەڕانەوەیاندا تووشی کەشتی یەکی نقوم بوو لە دەریادا بوون کە کەمێك لەمەو پێش لەدەریاکەدا نقوم بوو بوو، لەسەر ئاوەکە کوڕێکی گەنجیان بینی کە خۆی بە پارچە تەختەیەکی سەر ئاو کەوتوو گرتبوو، ئەوانیش ڕزگاریان کردو لەگەڵ خۆیان بردیانەوە بۆ شارەکەیان و داوایان لێ کرد کە ببێتە پاشایان بۆ ماوەی یەك ساڵ بەڵام گەنجەکە سەرەتا قبوڵی نەکرد بەڵام لە کۆتایدا ڕازی بوو

بێ بەپاشایان.

دوای ڕازی بوونی خەڵکەکە مەرجەکانی پاشایەتیان پێ ڕاگەیاند کە وەکو نەریتێکی باوی ئەم شارەی لێهاتبوو، ئەمیش دوای یەك ساڵ لە فەرمان ڕەوایەتی دەی بەن بۆ ئەو دوورگەیەی کە کۆتا پاشایان بۆ برد و لەوێ جێیان هێشت.

دوای سێ ڕۆژ لە فەرمان ڕەوایەتی پاشای نوێ لەم شارەدا پرسیاری لە وەزیرەکانی کرد ئایا بۆی هەیە ئەم دوورگەیە ببینێت کە سەرجەم پاشاکانی پێش خۆی بۆ ڕەوانە کراون بۆ مانەوەیان لە وێدا،وەزیرەکان ڕازی بوون بە پێشنیازەکەی پاشاو بردیان بۆ بینینی دوورگەکە، پاشا بینی کە دوورگەکە داپۆشراوە بە دارو درەختی چڕ و پڕ، پاشا گوێی لە دەنگی ئاژەڵی دڕندە بوو کە لەسەرجەم دوورگەکە دەنگی دەدایەوە.

پاشا دابەزیە ناو دوورگە کە لوێدا لاشەی پاشاکانی پێش خۆی بینی کە بەسەر زەویەکەدا بڵاو بوونەتەوە، لێرەدا پاشا لە سەرگوزشتەکە تێگەیشت کە پاش گەیشتنی پاشاکانی پێش خۆی و بەجێ هێشتنیان لەلای خەڵکەکە یەکسەر ئاژەڵی دڕەندە هاتوون بۆ لایان و کوشتوونی و پارچە پارچەی کردوون....دوای بینینی ئەم دیمەنە پاشا گەڕایەوە بۆ شارەکەی و سەد کرێکاری بە هێز و ئازای هەڵبژارد و بردنی بۆ ئەم دوورگەیە و فەرمانی پێکردن بە پاك کردنەوەی دارستانەکە و لابردنی لاشەی پەرش و بڵاوی پاشاکان و ئاژەڵەکان و ژێر خاك خستنیان،هەر بۆیە پاشا مانگی جارێك سەردانی دوورگەکەی دەکرد بۆ ئەوەی بەڕێوە چوونی کارەکانی بە چاوی خۆی ببینێت، کارەکەش زۆر بە خێرایی باشی بە ڕێوە دەچوو، بۆیە دوای تێپەر بوونی یەك مانگ هەرچی لاشەی گیانداران و لق و چڵی دارەکان هەیە پاك کرایەوە. هەروەها دوای تێپەڕ بوونی دوومانگ دوورگەکە بەتەواوی پاك بووە وە. دوای ئەوە پاشا فەرمانی بە کرێکارەکان کرد کە لە چواردەورەی دوورگەکە دەست بکەن بە چاندنی دار و درەخت و بە خێو کردنی هەندێك گیانداری بەسوود وەکو مریشك و مراوی و بزن و مانگا و....هتد.

لەگەڵ هاتنی سەرەتای مانگی سێیەمدا پاشا فەرمانی بە کرێارەکان کرد بە دروستکردنی

خانویەکی گەورە و شوێنێکی تایبەت بە ڕاوەستانی کەشتی یەکان.

بە تێپەڕ بوونی کات دوورگەکە بوو بە شوێنێکی جوان و دڵ گیر، پاشا لـە بـەر ئـەوەی زۆر زیرەك بوو جل و بەرگێکی زۆر سادە دەپۆشی و پارەیـەکی زۆر کـەمی لەمـەدا خـەرج دەکرد لە بەرێوە چوونی ژیانی ناو کۆشکدا بەڵام بەرامبەر بەمە پارەی کـۆدەکردەوە و دەی نارد بۆ نوێ کردنەوە و دروستکردنی ئەم دوورگەیە.

پاش تێپەڕ بوونی نۆ مانگ پاشا سەرجەم وەزیرەکانی کۆکردەوە و پـێ ی وتـن :مـن لـە سەرەتاوە دەم زانی کە چوونم بۆ دوورگەکە دوای یەك سـاڵ دەبێـت بـەلا م حـەز دەکـەم ئێستا بڕۆم بۆ دوورگەکە....بەڵام وەزیرەکان پێشنیازەکەی پاشایان قبوڵ نەکرد و وتیان: بە گوێرەی ڕێ و ڕەسمی کۆشك پێویستە سێ مانگی تر چاوەڕوانی بکەیت و دوای ئەوە دەت بەین بۆ دوورگەکە.

سێ مانگەکەش کۆتایی هات و ساڵێکی تەواو کرد و کاتی پاشاهات بۆ ئەوەی بیبـەن بـۆ دوورگەکە، خەڵکەکە جل و بەرگێکی جوان و گرانبـەهایان لەبـەرکرد و سـواری فیلێکـی گەورەیان کرد بۆ ئەوەی خوا حافیزی لە پاشا کەیان بکەن.

بەڵام پاشا پێچەوانەی نەریتی پاشـاکانی پـێش خـۆی زۆر دڵ خـۆش بـوو و پێدەکـەنی و زەردەخەنەی لەسـەر لێوەکانی بوو بۆیە خەڵکەکە پرسـیاریان دەربـارەی ئـەم حاڵـە لێ کـرد پاشاش بەم شێوەیە وەڵامی دانەوە و وتی: زانایان دەڵێن ((کاتێك منـداڵ لـەدایك دەبێـت و دێتە دونیاوە ئەو پێدەکەنێت و خەڵکی چوار دەوری پێدەکەنن،بۆیە وا لە دونیادا بـژی و وا کاری بۆبکە بۆ ئەوەی کاتێك مردن دێت بـۆ لات تـۆ پێبکـەنیت و بـەڵام ئەوانـەی چـوار دەورت بۆت بگرین)).

هەر لەبەر ئەوەی پاشاکانی پێشوو تر سەرقاڵ بوون بە ڕابواردنی خۆیان و سەرقاڵ بوونیان لە کاتی ماوەی فەرمان ڕەوایەتی یاندا.

بەڵام من لە کاتی ماوەی فەرمان ڕەوایەتیم دا سـەرقاڵی بیرکردنەوە بووم لـە داهـاتووم و لەخشەم بۆ ئەمە دانا و بۆیە هەستام بە چاکردن و نوێ کردنەوەی دوورگەکە و کردم بە بـە

هەشتێکی بچووك بۆ ئەوەی ئەو ماوەی تەمەنەی کە ماوەمە تیایدا بەسەر بەرم بە سەلامەتی.

چ پەندێك لەم چیرۆکە وە فێردەبین:

ئەم ژیانی دونیایە کێڵگەیەکە بۆ دوارۆژ بۆیە پێویستە زۆر ڕۆنەچین لە شەهوات و ئارەزووە دونییەکانمان و دوارۆژمان لەبیر بەرنەوە ئەگەر پاشا و کاربەدەستیش بین.

بۆیە پێویستە ژیانێکی سادە بەسەر بەرین وەك سەروەرمان ( دروودی خوای لەسەربێت) خۆشگوزەرانیەکانمان هەڵگرین بۆ دوا ڕۆژ.

هەروەها پێویستە فەرمایشتەکانی سەروەرمان ( دروودی خوای لەسەربێت) لە یاد نەچێت کە دە فەرموێت:(دوو پێی هیچ بەندەیەك ناترازێ لە ڕۆژی دوایدا هەتا چوار پرسیاری لێ نەکرێت لە تەمەنی کە چۆن بەرێی کردوە و لە گەنجێتیدا کە چۆن بەسەری بردوە و لە سەروەت و سامانی کە چۆن پەیدای کردوە و لە چیدا خەرجی کردوە و لە زانست و زانیاریدا چۆن کاری پێ کردووە.

هەر بۆیە باش بزانە کە دونیا کێڵگەی دوارۆژە.

# ماسیگرە بێ ئاگاکە.....



لێرە ماسی گرێك هەبوو... دڵسۆز بوو لە کارەکەیدا،

هەموو ڕۆژێك ماسی یەکی ڕاودەکرد و... لەماڵەوەدا دەمایەوە ئەوەندەی ویستی خـودای لەسەر بوایە،

تاوەکو کۆتایی دەهات... دەچووەوە بۆ سەر ڕووبار بۆ ئەوەی ماسی یەکی تر ڕاو بکات،

ڕۆژێك لە ڕۆژان،

کاتێك خێزانەکەی خەریکی پارچە پارچە کردنی ماسیێك بوو کە مێردەکەی ڕاوی کردبوو،

شتێکی سەیری بینی!

لەناو سکی ماسیەکەدا مرواریەکی بینی،

سەری سوڕما!

مرواری لە سکی ماسیدا..؟؟

پاك و بێگەردی بۆ خودا،

پیاوەکە..پیاوەکە...تەماشابکە چیم دۆزیەوە؟

چی؟

ئەوە مرواری یە، مرواری!!

مرواری لە سکی ماسی دا!

ئای چەند ە خێزانێکی باشی...بۆم بێنە..بەڵکو ئەمرۆی پێ بەسەر دەبەین...شتێکی جیا لـە

ماسی پێدە خۆین،

ماسی گرەکە مرواریەکەی برد

بۆلای دوکانی مرواری کڕێك کە لە تەنیشت ماڵەکەیەوە بوو،

مرواری کڕە دراوسێیەکەی تەماشای مرواریەکەی کرد،

من ناتوانم بیکڕم ئاااااای...ئەمە بە پارە مەزەندە ناکرێت...

ئەگەر دوکانە کەم و خانوەکەشم بفرۆشم هێشتا ناتوانم نرخەکەیت بدەمێ،

بەڵام وەرە برۆ بۆ لای سەرۆکی کڕیاران لەو شارەی نزیکمانەوە

بەڵکو ئەو بتوانێت لێتی بکڕێت و نرخەکەیت بداتێ!

ماسی گرەکە مرواریەکەی برد....بۆلای کڕیارە گەورەکە...لەشارەکەی دراوسێیان

چیرۆکەکەی بۆ گێرایەوە،

اللە...اللە...برایەکەم... ئەوەی تۆ هەتە بە پارە مەزەندە ناکرێت!!

بەڵام رێگا چارەیەکەم بۆ دۆزیەوە...برۆ بۆ لای فەرمان رەوای شار

تەنها ئەو توانای کڕینی ئەو جۆرە مرواریانەی هەیە؟

لە بەر دەم دەرگای کۆشکی فەرمانڕەوای شاردا

ماسی گرەکە وەستاو مرواریە گرانبەهاکەی بەدەستەوە بوو...چاوەڕوانی رێپێدانی چوونە ژوورەوەی دەکرد،

فەرمانڕوا ئای خودایە! من بەدوای مرواریەکی ئاوام دەگەڕام... بەڵام نازانم چۆن بەهاکەت بۆ دیاری بکەم!

بەڵام رێگات پێدەدەم بچیتە ناو گەنجینە تایبەتیەکەم!

شەش کاتژمێر تێیدا بمێنەوە.... هەرچی دەتەوێت بیبە بۆ خۆت...ئەمەش نرخی مرواریەکەتە؟

گەورەم..بەڵکو بۆم بکەیت بە دوو کاتژمێر...چوونکە شەش کاتژمێر بۆ ماسی گرێکی وەکو من گەلێك زۆرە؟

نەخێر...بەڵکو هەردەبێت شەش کاتژمێر بێت بۆ ئەوەی هەرچی یەکی دەتەوێت لەگەڵ خۆتدابیبەیت!

ماسی گرەکە چووە ناو گەنجینەی فەرمانڕەوا....تەماشای کرد دیمەنێکی ترسناکە،

ژوورێکی زۆر گەورە...دابەش کرابوو بۆ سێ بەش،

بەشێکی پڕ بوو لە خشڵ و زێڕ،

بەشێکیشی بە ڕاخەری نایاب...ئەگەر تەماشات کردبوایە خەودەی بردیەوە بۆ پشوودان،

بەشەکەی تریشی هەرچیەك ئارەزووت لێبێت لە خواردن و خواردنەوە،

ماسی گرەکە لە گەڵ خۆیدا کەوتە گفتوگۆ؟

شەش کاتژمێر؟؟

ئەو یەجگار زۆرە بۆ ماسی گرێکی هەژاری وەکو من؟؟

چ لە شەش کاتژمێرە بکەم، باشە.. دەست دەکەم بە خواردن کە لە بەشی سێیەم دایە،

دەخۆم تاوەکو سکم پڕ دەبێت!

بۆ ئەوەی هێزم زیاتر بێت بۆ هەڵگرتنی بەشێکی زیاتر لە خشڵ و زێڕ!

ماسی گرەکە چووە بەشی سێیەم،

سێ کاتژمێری لەوێدا بە خواردن و خواردنەوە بەسەر برد...هەتا کو تەواو بوو.. دواتر چووە بەشی یەکەم،

لە ڕێگای خۆیدا چاوی بەو ڕاخەرە جوان و دڵ ڕفێنەنانە کەوت... بەخۆی وت:

بۆ کەمێك ئەخەوم بۆ ئەوەی وزەو توانا زیاتر بکەم بۆ ئەوەی بتوانم بەشێکی زیاتر لە خشڵ و زێڕ هەڵگرم،

ئەمە هەلێکەو دووبارە نابێتەوە...ئەوە چ گێلیەکە لەدەستی بدەم،

ماسی گرەکە چوو بەرەو شوێنی خەوتن...لەسەر پشت ڕاکشا...کەوتە خەوێکی قوڵەوە،

پاش تاوێك لە کات،

پێیان وت : هەستە..هەستە ماسی گرە بێمێشکەکە... کاتەکەت تەواو بوو!

ئائائائا....چی چی؟؟

بەڵێ بەڕست هەستە بڕۆ دەرەوە!

داواتان لێدەکەم...کاتی تەواوم وەرنەگرت؟

نا...نا.. شەش کاتژمێر نەتۆ لە ناو ئەو گەنجینەیەدایت... ئێستا لە بێئاگای وە خەبەردێیت دەتەوێت خشڵ و زێڕ بەیت..؟؟

ئایا بۆت نەبوو هەرچی یەکی دەتەوێت لەو خشڵ و زێڕە بەیت و بێتەدەرەوە

هەرچی لە دەرەوە لە باشترین خواردن و خواردنەوە و نایاب ترین ڕاخەر بکڕیت!

بەڵام تۆ نەزان و بێمێشك بێئاگا بوویت،

تەنها بیرت لە چواردەوری خۆت دەکردەوە کە تێدایت...بۆیە بڕۆن بیبەنە دەرەوە!

نا...نا... داواتان لێدەکە....داواتان لێدەکەم.....نا....نا.....ن....!!!!!!!!!!

(( لێرەدا چیرۆکەکەمان کۆتایی پیهات))

بەڵام پەند وەرگرتن تاکو ئێستا کۆتایی پێنەهاتووە:

مروارییەکەتان بینی: ئەوە گیانی خۆتە( روح)، ئەوە گەنجینەیەکە بە پارە مەزەندە ناکرێت....بەڵام ئێمە بەهای ئەو گەنجینەیە نازانین.

ئایا گەنجینەکەت بینی...؟؟ ئەوەشیان دونیایە، تەماشای گەورەیی بکە و، تەماشای سوود لێوەرگرتنی ئێمە بکە بۆی.

بەڵام خشڵ و زێڕەکە: ئەمەیان کردەوە چاکەکانمانە.

بەڵام ڕاخەرە ڕازاوەو ئاوریشمەکان: ئەوە بێئاگاییە.

بەڵام خواردن و خواردنەوەکە:ئەمەیان ئارەزو شەهەواتە.

ئەی ئێستا.... برای ماسی گر ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە لە خەو هەڵسی... ڕاخەرە ئاوریشمەکەت بەجێبهێڵی دەست بکەی بە کۆکردنەوەی خشڵ و زێڕی لە بەردەستدایە

پێش ئەوەی ئەو کاتەی کە بۆت دیاری کراوە.... کە ئەویش تەمەنتە

دواتر بە ئاخ هەڵکێشان و حەسرەت دونیا بە جێبهێڵی.......!!!

# مایکل و ئەسپەکە



کاتێك ( مایکل) گەڕایەوە ماڵەکەی شەو تاریك داهاتبوو... بە تەنیا بوو...ئەسپێکی دۆزی بۆوە. کاتێك گەڕایەوە ماڵەوە لە باوکی پاڕایەوە کە ئەسپەکە بهێڵێتەوە، باوکی گوتی: دەتوانی تەنها ئەو شەو ئەسپەکە گل بداتەوە چونکە ڕەنگە خاوەنەکەی بەدوایدا بگەڕێ... ئینجا باوکەکە گوتی: لەبەرەبەیان پێت دەڵێم چی بکەی...

ئەو شەوە مایکل هەر نەخەوت...هەموو خەونێکی ئەوە بوو درێژترین ماوە لەگەڵ ئەسپەکە بەسەر بەرێت... کاتێك باوکی چووە سەرجێگای خەوتن خۆر هەڵاتبوو و هەمووان لەماڵەوە هەڵسابوون لە خەو...باوکەکەهات بۆ ئەوەی کوڕەکەی ببینێ و پێی گوت: پێم وایە ئێستاکە لەسەرتە ئەسپەکە بگەڕێنیتەوە بۆ خاوەنەکەی. مایکل گوتی: بەڵام باوکە من نازانم خاوەن ئەسپەکە لە کوێ دەژیت...نازانم چۆن بیگەڕێنمەوە..باوکەکە بەزەردەخەنەیەکی ماڵئاوایی یەوە سەیری کوڕەکەی کرد و ئینجا گوتی:مایکل لەگەڵ ئەسپەکە بڕۆ و وازی لێ بهێنە بۆ خۆی ڕێگات بۆ دەکاتەوە...

مایکل جلەکانی لەبەر کرد بۆ ئەوەی بڕوات لە کاتێکدا باوەڕی بەو قسانە نەدەکرد کە گوێ بیستی بوو، بەڵام پاش دەرچوونی لە ماڵەوە هەروەکو باوکی پێی گوتبوو بە تەنیشت ئەوگیاندارەجوانەوە دەڕۆیشت...ئەو کوڕە سەرسام بوو کەبینی ئەسپەکە بەرەو ڕاست ئینجا بەرەو چەپ دەسوڕێتەوە.بە شانازیەوە... بەم شێوەیە مایکل بەشوێن ئەسپەکە دا

دەرۆیشت...دواجار مایکل بە خۆشی و خەندەوە گەیشتە گوندێك و کاتێك گوند نشینەکان ئەسپەکەیان بینی بەراکردن هاتن و سوپاسی مایکل یان کرد لەسەر گێڕانەوەی ئەسپەکە و دیاریەکیان پێدا. کاتێك مایکل گەڕایەوە ماڵەوە...باوکی پرسیاری لێ کرد ناخۆ ئەسپەکەی گێڕاوەتەوە... مایکل سەرێکی بۆ لەقاند و گوتی:هەروەك پێت گوتم وام کرد ئەسپەکە ڕێگای گرتەبەر تاگەیشتەوە بە خاوەنەکەی. دوای کەمێك بیرکردنەوە زیاتر گوتی: دەزانی باوکە شتێك هەیە دەمەوێت پێی بڵێم. دڕێنی کەئەسپەکەم دۆزی یەوە شادمان بووم و بەوهیوایە بووم کە بوارم بدەیتێ ئەسپەکە لای خۆم بهێڵمەوە،بەڵام ئێستاکە زیاتر شادومانم چونکە توانیم یارمەتی ئەو خەڵکانە بدەم لەو گوندە..بەڵام باوکە گیان...دەزانم کە تۆ داوات لێ کردم ئەسپەکە بگێڕمەوە لەبەر هۆیەك بوو.باوکەکە بەخەندەوە گوتی:کوڕەکەم بێگومان بە ختەوەری لە هاوکاری و بەخشین سەرچاوە دەگرێ و کاتێك یارمەتی ئەو خەڵکەت دا هەستت بە شادومانی کرد ئەوەش یەکەمین وانەیە بۆ تۆ.وانەی دووەمیش ئەوەیە کاتێك لەگەڵ ئەسپەکە دەرۆیشتی ڕێگای خاوەنەکەی دۆزی یەوە بێ ئەوەی هیچ کاریگەری تۆی لەسەربێت...

کوڕەشیرینەکەم پێویستە خەڵکی وەکو خۆیان پەسند بکەی و هەوڵ نەدەی بیانگۆڕی بەڵکو خۆت بگۆڕە...ئەگەر دەتەوێت خەڵك پەسندت بکەن...وەکو خۆیان پەسندیان بکە و ئەگەر خوازیاری ڕێزیت بگرن ئەوا تۆش ڕێزیان بگرە و ئەگەر دەتەوێ زەردەخەنەت بۆ بکەن ئەوا دەم بەخەندەبە بۆیان و ئەگەریش دەتەوێ خۆشیان بوێ ی ئەوانت خۆش بوێ... ئەگەر دەتەوێ وەربگری بەبێ چاوەڕوانی ببەخشە بەبێ بەرامبەر،لە دوارۆژ بەدەیان جار خوای گەورە و بەدەسەڵات پاداشت دەداتەوە.

لەبەر ڕۆشنایی ئامۆژگاری باوکی، مایکل زیاتر تێگەیشت و هەستی کرد، لەگەڵ تێپەڕ بوونی کات بوو بەمامۆستای گەیاندن. هەروەها تۆش دەتوانی هەمان کار ئەنجام بدەی.. ئەمڕۆ دەست بکە بە کاریگەری لە سەر خۆت ،چونکە ئەگەر هەوڵ بدەی کاریگەریت لەسەر کەسانی تر هەبێ ئەوا هەست بە بێ هیوایی و زەبوونی دەکەی..هەروەکو گاندی

دەڵێت: ئەو گۆڕانکاریە بە خوازیاری لەجیهاندا ڕوودەدات...باوەڕت بە هێز و پتەو بێت کە تۆ سەراسیمەیی و کەس لە تۆ ناچێت بەتەواوی نە لێرە و نە لە هیچ شوێنێکی تر... کەسانی تر پەسند بکە...خۆشت بوێن...پێ یان ببەخشە و لە نیاز و خواستەکانیان حاڵی ببە...

من بۆت دابین دەکەم نەك تەنها بەگەورەترین پیاوی گەیاندن دابنرێ ی لە مێژوودا بەڵکو هەروەها لە ژیانێکی پڕشادومانی و بەختەوەری دا بژی.

## نەعلەکانی پاشا




دەگێڕنەوە پاشایەك هەبوو فەرمانڕەوایەتی دەوڵەتێکی زۆرگەورەی دەکرد...ڕۆژێکێکیان پاشای وڵات ئارەزووی کرد گەشتێکی دووروو درێژ بەناو وڵاتەکەیدا بکات.

لە کاتی گەڕانەوەی دا پێستی پێکانی پاشا هەڵئاوسابوون، بەهۆی زۆر ڕۆیشتنی بە ڕێگا دژوارو سەختەکاندا، هەر بۆیە فەرمانێکی شاهانەی دەرکرد بە داپۆشینی سەرجەم ڕێگاو بانەکانی وڵاتەکەی بەپێست، بەڵام یەکێك لە ڕاوێژکارەکانی ئاماژەی بە ڕایەکی باشتر کرد بۆ پاشا ئەویش بە دانانی تەنها پارچە پێستێك بۆ ژێر پێکانی پاشا لەبری پێست ڕێژکردنی سەرجەم ڕێگاکان و بەتەنهاو بەس...؟؟

چ شتێك لەم چیرۆکە فێردەبین:

ئەگەر دەتەویێ خۆش بەخت و ئاسوودە بژیت لە ژیان هەوڵ مەدە سەرجەم جیهان بگۆڕیت بەڵکو هەستە بە گۆڕینی خۆت یەکەم جار، پاشان هەوڵی گۆڕینی سەرجەم جیهان بدە..؟؟

## نهێنی خۆش بەختی...



دەگێڕنەوە جارێکیان بازرگانێك کوڕەکەی نارد بۆلای داناترین کەس لە جیهان بۆ ئـەوەی نهێنی خۆش بەختی فێر ببێت، کاتێك کوڕەکە گەیشتە لای پیاوە داناکـە، داناکـە زۆر بـە بێدەنگی و ئاگاداری یە وە تەماشای کوڕەکەی دەکرد بۆیە پێ ی وت: ئێستا زۆر کاتمان نی یە، بۆیە داوای لێ کرد کەشتێك بەناو کۆشکدا بکات و دوای دوو سەعات بگەڕێتـەوە بـۆ لای بۆ چاوپێکەوتن و دیدەنی....هەروەها پیاوە داناکە لەو گەشتەیدا کەوچکێکی بچووکی دایە کوڕەکە کە کەمێك ڕۆنی تێدا بوو: داوای لێ کرد کە ئاگاداری کەوچکەڕۆنەکە بێـت و ڕۆنەکەی ناوی نەڕژێت لەگەڕانەکەی بەناو کۆشکدا.

کوڕەکە دەستی بەگەڕان کرد، بەسەر پلیکانەکان سـەردەکەوت و دادەبەزیـە خـوارە وە بەڵام چاوی هەر لەسەر کەوچکە ڕۆنەکە بوو....دوای دووسەعات گەڕایـەوە بـۆلای پـیاوە داناکە بۆ چاوپێکەتن و دیدەنی، پیاوە داناکە پرسیاری لێ ی کـرد:ئایـا مـافورە ئێرانیەکـەت بینی لە ژووری نان خواردن...؟ و باخچە جوانەکە و....؟ئایـا پەڕتووکـە بەنرخـەکانی نـاو کتێبخانەکەم سەرنجیان بۆلای خۆیان ڕاکێشای.......؟؟

کوڕەکە پەشۆکا و دانی نا بەوەی کە ئەو هیچی نـەبینیوە، چـونکە ئـەو خـەمی سـەرەکی ئەوەبوو کە نە هێڵێت ڕۆنی ناو کەوچکە بڕژێت و بەس.!

پیاوە داناکە پێ ی وت: ئەو جارە بچۆرە سەیری چۆنیەتی بیناسازی کۆشکەکە بکە.؟
ئەو جارە کوڕەکە گەڕایەوە بۆ گەڕان بە ناو کۆشکدا،بەڵام ئەوجارە زۆر بە وردی سەیری کارە هونەریەکانی سەر دیواری کۆشکی دەکرد کە زۆر سەرنج ڕاکێش بوون....ئەوجارە باخچە و گوڵە جوانەکانی ناو باخچەکەی بینی....کاتێک گەڕایەوە لای پیاوە داناکە ئەو شتانەی بینیویەتی بە دوور و درێژی بۆی و گێڕایەوە.
پیاوە دانایەکە پرسیاری لێ کرد: بەڵام کوا ئەو ڕۆنەی پەیمانت پێم دابوو کە بیپارێزیت لەناو کەچکەکە...؟کوڕەکە سەیری کەوچکەکەی کرد بینی هیچی تێدانەماوە و وشک بۆتەوە....
پیاوە دانایەکە پێ ی وت: ئەوە ئەو ئامۆژگاریەیە کە دەمەوێت پێتی بڵێم....نهێنی خۆش بەختی ئەوەیە کە جوانیەکانی دونیا ببینی و چێژیان لێ وەربگریت بێ ئەوەی بە هیچ جۆرێک ڕۆنی ناو کەوچکەکە بڕێژیت.
لێرەدا کوڕەکە لە ناوەڕۆکی چیرۆکەکە تێگەیشت، کە خۆش بەختی بەرەنجامی لێکدانی هاوسەنگی نێوان شتەکانە، ڕۆنی نێو کەوچکەکەش پۆشاک لەش ساغی یە....هەردووکیان داهێنانێکی سەرکەوتوون دژی بەدبەختی

# وەرزێر و ئەسپەکەی.....!!



ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەسپی یەکێك لەوەرزێرەکان کەوتە نا بیرێکی ئاوی قوڵ بەڵام وشك بوو،ئەسپەکە دەستی کرد بە حیلە حیل....بەم شێوەیە چەند کاتژمێرێك بەردەوام بوو، لەم کاتەدا وەرزێرەکە کەوتبووە هەڵسەنگاندنی حاڵەکە، ئایا چۆن ئەسپەکە ڕزگاربکات؟ زۆری پێنەچوو هەتا باوەڕی بە وە پەیدا کرد کەوا ئەسپەکە پیر بووە،تێچوونی دەرهێنانیشی نزیك دەبێتەوە لە تێچوونی ئەسپێکی لەوباشتر ؟بۆیە وەرزێرەکە، وەرزێرە دراوسێکانی بانگکرد و داوای لێکردن کە هاوکاری بکەن بۆ پڕکردنەوەی بیرەکە بۆ ئەوەی دوو کێشە بە جارێك چارەسەربکات؟! ڕزگار بوون لە بیرە وشك بووەکە و داپۆشین و زیندەبەچاڵ کردنی ئەسپەکە!! بۆیە بە پاچ و بێڵ کەوتنە کۆکردنەوەی خۆڵ وخاشاك و فڕێدانی بۆ ناو بیرەکە، هەر لەو کاتەشدا ئەسپەکە هەستی بەم پلانەی خاوەنەکەی کردبوو،بۆیە دەستی کرد بە حیلاندن بەدەنگێکی بەرز، کەپڕی بوو لە ئازار و داوای هاوکاری کردن، پاش کەمێك هەموویان سەریان سوڕما بە بێدەنگ بوونی ئەسپەکە؟ پاش کەمێك لە پڕ کردنەوەی بیرەکە لە ناکاو، وەرزێرەکە تەماشای ناوبیرەکەی کرد بۆ ئەوەی بزانێت چ دەگوزەرێت لەناو بیرەکەدا؟ بۆیە سەری سوڕما بەوەی کەبینی؟ چونکە لەو کاتەدا ئەسپەکە سەرقاڵی جوڵاند و تەکاندنی پشتی بوو لەو خۆڵەی دیانکردە نا بیرەکە،کە خۆڵەکە دەکەوتە ژێر قاچەکانی، هەرجارەی ئەسپەکە هەنگاوێك بەرزدەبوەوە بۆ

سەرەوە!!بەم شێوەیە بەردەوام بوو لەسەر جوڵاندنی پشتی و کەوتنە خوارەوەی خۆڵەکە بۆ ژێر قاچەکانی، بۆیە هەنگاو بەهەنگاو بەرزدەبوەوە بۆسەرەوە، پاش تەواو بوونی کاتی پڕکردنەوەی بیرەکە، ئەسپەکەش لە دەرەوە نزیك کەوتبوەوە، بۆیە بازێکی ئاسایی هەڵدا و هاتەدەرەوە لە بیرەکە بە سەلامەتی؟!

لێرەدا چیرۆکەکەمان کۆتایی پێهات....

ژیانیش ئاوا هەموو ئازار و مەینەتی و قورسایی خۆی دەخاتە سەر شانت؟ هەرکاتێك هەوڵتدا خەم و خەفەتەکانت وەلانێی ئەو تۆی لەیاد ناچێت، بەردەوام دەبێت ئازار و مەینەتیەکانی بۆسەرتۆ؟ بۆیە هەر کێشەیەك کەدێتە بەردەمت مشتێکە لەو خۆڵە؟ بۆیە پێویستە لەسەرشانی لابەی بۆئەوەی بەسەریدا زاڵ بیت؟بەم شێوەیە هەنگاوێ بەرە سەروو بەرز ببیتەوە! هەندێکی تریش فڕێدە ژێرپێت بۆ ئەوەی هەنگاوێکی تریش بەرەو سەروو بەرز ببیتەوە؟ بۆئەوەی ڕۆژێك خۆت لە لوتکەدا ببینیتەوە؟؟!!

ڕامەوەستە و خۆت بەدەستەوەمەدە، هەرچەندە هەست بکەی کە خەڵکانێك هەن دەیانەوێت زیندە بەچاڵت بکەن؟ هەموو خەم و خەفەت و ناڕەحەتیەك لەدڵ دەربکە، هەموو دڵە ڕاوکێیەك لە مێشکت دەربکە؟ ژیانت بەسادەی ببەسەر، زیاتر لە بەخششەکان وچاوەڕوانی ناخۆشیەکان بە، چاوەڕوانی بەدەستهێنانی کەم بە، پشت بە خودا ببەستە و دڵ ئارام بە بە دادگەریەکەی؟!

# وەسیەتنامەی ئەسکەندەری مەکدۆنی



لەکاتی گەڕانەوەیدا لەیەکێك لەجەنگەکانی کە سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەستهێنابوو و،لەکاتی گەیشتنەوەی بە وڵاتەکەی خۆی،تەندرووستی ئەسکەندەر تێکچوو چەند مانگێك لە جێگادا کەوت، کاتێك مەرگی پاشا کە خاوەنی رۆژهەڵات و ڕۆژ ئاوا بوو نزیك بوەوە و نینۆکی بەگیانی داکرد، ئەوکاتە ئەسکەندەر تێگەیشت کە وا ژیانی بەرەو کۆتایی دەچێت و زۆری لە ژیاندا نەماوە نە سەرکەوتنە زۆرەکانی و نە سوپا بێشومارەکەی ونە شمشێرە قرتێنەرەکەی و سەرجەم موڵك ومالّی بەدەم بادا دەڕۆن، ئا لەم کاتە دا سەرجەمی دەست و پێوەندەکانی وکەسە هەرەنزیکەکانی کۆکردەوە، هەروەها سەرکردەی سوپاکەی کە زۆری خۆش دەویست و لێی نزیك بوو بانگ کردوو و پێی وت: من ئەوا لەم نزیکانە ژیان بەجێ دەهێڵم، من سێ ئاواتم هەیە لەدوای مردن داوات لێدەکەم کەبۆم جێ بە جێ بکەیت بەبێ کەم و کورتی.

سەرکردەی سووپاکەی لێی نزیك بوەوە و کە چاوەکانی پڕ لە فرمێسك بووبوون خۆی چەماندەوە بۆ ئەوەی دوا وەسیەتەکانی پاشاکەی گوێ لێبێت.

پاشا وتی: وەسیەتنامەی یەکەمم....دارە مەیتەکەم جگە لە پزیشکەکانم هیچ کەسی تر هەڵی نەگرێت تاکو شوێنی ناشتنم.

وەسیەتنامەی دووەمم....لە سەر ڕێگای شوێنی مردنم تاکو شوێنی ناشتنم هەرچی زێڕ و

زیو و بەردەبەنرخەکانم هەیە کە لەماوەی ژیانمدا کۆم کردبوونەوە پەرش و بڵاوی بکەنەوە.

وەسیەتنامەی سێیەمم و کۆتاییم... کاتێك هەڵتانگرتم بۆ سەر دارەبازەکەم هەردوو دەستەکانم لە کفنەکەمدا دەربهێنن و بە هەڵواسراوی و کراوەیی بیان هێڵنەوە.

کاتێك پاشا کۆتایی بەوەسیەتەکانی هێنا سەرکردەی سوپاکەی هەڵسا و هەردوو دەستی ماچ کرد و نانی بە سینگی خۆ یەوە، پاشان وتی: وەسیەتەکانت هەموویان لەژێر جێبەجێکردندان بەبێ کەم و زیاد و ناپاکی تێداکردنیان، بەڵام ناکرێت مەبەستی پاشای بەرێزمان بزانین لەدوای ئەو ئاواتانەی چی یە؟

پاشا هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو وتی:دەمەوێت دەرسێکی وا بەجیهان بەگەیەنم کە تاکو ئێستا نەیگەیشتبێت،

دەربارەی وەسیەتی یەکەمم، دەمەوێت هەموو خەڵك بزانێت ئەگەر مردن هات هیچ شتێك دادت نادات تاکو ئەو پزیشکانەی کە ڕادەکەین بۆ لایان کاتێك تووشی ناخۆشیەك دەبین،چونکە ساغی و تەمەن دوو سامانن هیچ کەسێك ناتوانێت لە دونیادا پێت ببەخشێت.

بەڵام دەربارەی وەسیەتی دووەمم، هەتاکو سەرجەم خەڵکی بزانن ئەو هەموو کاتەی خەرجمان کرد بۆ کۆکردنەوەی سەروەت و سامان هیچ نیە تەنها تەپ و تۆزی بڵاو بووەوەی دەم باوە نەبێت، بۆیە ئێمە هیچ شتێکیان لەگەڵ خۆماندا نابەین تاکو تەڵەزمە زێڕێکیش.

بەڵام دەربارەی وەسیەتی سێیەمم، بۆ ئەوەی سەرجەم خەڵکی بزانن ئێمە لە سەرەتادا بەدەستی بەتاڵ هاتوینە سەردونیاو هەر بەدەستی بەتاڵیش بە جێی دەهێڵین.

هەروەها لە دوا وتەکانی پاشا پێش مردنی : فەرمانی دەرکرد کە هیچ پەیکەرێکی ناسراو لەسەر گۆڕەکەی دانەنرێت بەڵکو گۆڕێکی ئاسایی بێت وەکو سەرجەم خەڵکی، تەنها هەردوو دەستەکانی بەدەرەوەبن بۆ ئەوەی هەرکەسێك بەسەر گۆڕەکەیدا ڕابووڕێت ببینێت کە ئەو پاشایەی خاوەنی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بوو، بەدەستی بەتاڵ لێی چووە دەرو بەجێی هێشت.

# ئەگەر دە قسەشم پێ بڵێی..........!!



ڕۆژێكیان دەمەقاڵێ یەك لە نێوان (ئەحنەفی كوڕی قەیس) كە بە ئارامی بەناوبانگ بوو لەگەڵ كەسێكی ئاسایی ڕووی دا، كابراكە بە ئەحنەفی وت ئەگەر قسەیەكم پێ بڵێیت دە قسەت پێ دەڵێم، ئەحنەف وتی: ئەگەر تۆ دە قسەم پێ بڵێیت من یەك قسەت پێ ناڵێم...!!

كابرا ئاسایی یەكەی زۆر قسەی بە ئەحنەف وت بەڵام ئەحنەف وەڵامی نەدایەوە، بەردەوام بوون لە ڕۆیشتن تاكو نزیك بوونەوە لە عەشیرەتی ئەحنەف، بۆیە ئەحنەف بە كابرای وت: ئەگەر هیچ شتێكی تر لەدڵتدا ماوە پێمی بڵێ پێش ئەوەی بگەینە ناو عەشیرەتەكەم بۆئەوەی كەسێكی تر گوێی لێ نەبێت نەوەك ئازارت پێ بگەیەنێت..!

دەگێڕنەوە جارێكیان كابرایەك جنێوی بە یەكێك لەدانا كان وت بەڵام ئەو وەڵامی نەدایەوە، لە داناكەیان پرسی بۆچی وەڵامت نەدایەوە داناكە وتی: ئەگەر سەگ پێت بوەڕێت ئایا تۆش وەكو ئەوپێ ی دەوەڕیت وتیان: نەخێر،ووتی ئەی ئەگەر گوی درێژ جووتەیەكی لێدایی ئایا تۆش وەكو ئەو جووتەی لێ دەدەیتەوە وتیان: نەخێر،ووتی ئەی ئەگەر گا جووت قۆچی لێدای تۆش وەكو ئەو قۆچی لێ دەدەیتەوە وتیان: نەخێر، وتی كەواتە لێمان گەڕێن با خۆمان جیا بكەینەوە لە ئاژەڵ....!!

گرنگ نی یە چیمان بەسەر دێت گرنگ ئەوەیە چۆن بەرە و ڕووی دەبینەوە..!

ژیان هەمووشتێك ناداتە هیچ كەسێك كە پێویستیەتی، یان زیاتری پێ دەدات یان كەمتری پێ دەدات...!

# ئەوەی پێویستمانە باوەڕ بە خۆ بوونە



خاوەن کارێکی قەرزدار هیچ ڕێگە چارەیەك شك نابات بۆ دەرباز بوون لەو حاڵەتەی تێ ی کەوتووە جگە لەوەی لەسەر کورسیەك لە باخی گشتی دابنیشێ کەلەو پەڕی خەم و پەژارە دایە و دەپرسێ ئاخۆ کەسێ هەیە ڕزگاری کات،وەکو کۆمپانیاکەی لە مایە پوچ بوون دەرباز بکات؟ لە ناکاو!پیرە پیاوێك دەردەکەوێ و پێ ی دەڵێت : وابزانم شتێك بێزاری کردووی، خاوەن کارەکە باسی سەر گوزشتەی خۆی بۆ دەکات، پیاوە پیرەکەش وەڵا می دەداتەوە و دەڵێ: پێم وایە دەتوانم هاو کاریت بکەم، ئینجا پرسیاری لە پیاوەکە کرد کە ناوی چی یە و چەکێکی بۆ نووسی و پێ ی داو گووتی:ئەم پارەیە وەرگرەو دوای ساڵێك لەم شوێنە بمبینەوە بۆ ئەوەی پارەکە بگەڕێنیتەوە،پاش ئەوەی پیرە پیاوەکە ڕۆیشت و خاوەن کارەکە مایەوە لە دڵەڕاوکێ دا بوو چەکی پارەکەی ئاودیوو دیوو دەکرد کە بایی نیو ملیۆن دۆلار بوو واژۆی لەسەر کرا بوو ( جۆن دی ڕۆکفلر) خاوەن کارێکی ئەمریکیکە بەناوبانگترین دەوڵەمەندی جیهان بووە لەماوەی ١٨٣٩ ز– ١٩٣٧ ز.

ئەو سامانەی لەمیانەی کارکردنی لەبواری پترۆڵ کۆکردبۆوە،ولەپاشان بوبەیەکێك لەناودارەکان.ڕۆکفلرلەمیانەی ژیانیدا بڕی(٥٥٠) ملیۆن دۆلاری ئەمریکی لەپرۆژە خێرخوازییەکان خەرج کردوە.پیاوەکەلەسەرسامی یەکەی بەهۆش هاتەوەو بەگەرمی یەوە گوتی:ئێستاکە دەتوانم بەم پارانە هەموونیگەرانیەکانم بەلاوەبنێم،ئنجا کەمێك بیری کردەوەو بڕیاریدا هەوڵ بدات کۆمپانیایەکەی لەمایەپوچ بوون بپارێزێ بێ ئەوەی چەکەکە خەرج

بکات کەبەسەرچاوەی هێزو توانای خۆی دەزانی.بەگەشبینیەوە بەرەو کۆمپانیاکەی ڕۆیشت ودەستی کردبەکارەکانی و دانوستانی سەرکەوتوی لەگەڵ خاوەن قەرزەکان کرد بۆ داواخستنی وادەی دانەوەی قەرزەکان. هەروەها توانی پرۆسەی فرۆشتنی گەورە لەبەرژەوەندی کۆمپانیاکەی ئەنجام بدات.لەمیانەی چەندمانگێك توانی قەرزەکانی بداتەوە. سەرلەنوێ دەستی بەقازانج کردن کردەوە

دوای تەواو بوونی ساڵێ دیاری کراو لەلایەن پیرە پیاوەکەوە، پیاوەکە بە گەرم و گوڕی یەوە بەرەو باخەکە چوو کەسەیری کرد پیاوە پیرەکە چاوەڕوانی دەکات لەسەر هەمان کورسی، خۆی پێ نە گیراو چەکەکەی پێ دایەوە کەخەرجی نەکردبوو، دەستی کرد بە گێڕانەوەی بەسەرهاتی ئەو سەرکەوتنانەی بەدەستی هێناون بێ ئەوەی چەکەکە ورد بکاتەوە.لەناکاو پەرستارێك بەپەلە بە ئاراستەی پیرە پیاوەکە هات و گوتی: سوپاس بۆ خوا کە تۆم لێرە دۆزی یەوە، لەدەستی وەرگرت، بەخاوەن کارەکەی گووت: هیوادارم بێزارم نەکردبیت، ئەو هەمیشە ڕادەکات لەو نەخۆشخانەیەی کەتایبەتە بە شێتان لە تەنیشت ئەم باخ چەیە،وا لە خەڵکی دەگەیەنێت ( کە ئەو جۆن دی ڕۆکفلر) ە.

پیاوە خاوەن کارەکە بەسەرسامی یەوە وەستاو بیری دەکردەوە لە تەواوی ئەم ساڵە کە تێپەڕیوە و کۆمپانیاکەی لەترسی مایە پووچ بوون دەر کردوو سەودای کڕین و فرۆشتنی دەکردوو بە هێزەوە دانوستانی دەکرد چوونکە باوەڕی وابوو کە نیو ملیۆن دۆلار لە پشتیەوەیەتی!!

ئەوساکە هەستی کرد کە پارە و پول ژیانی ئەوی نە گۆڕی وە و کۆمپانیاکەی ڕزگار نەکردووە، بەڵکو ئەوەی کە گۆڕیویەتی دۆزینەوە تازەکەیەتی کە بریتی یە لە ( باوەڕ بە خۆ بوون) ئەوە هێز و توانات پێ دەبەخشێ کە بتوانی بەسەر مەترسی دارترین شکستدا زاڵ بی و مەزنترین سەرکەوتن بەدەست بێنی. ئەوەیە کە دەقا و دەق پێوویستمانە.

## منداڵەکەو دارسێوە میهرەبانەکە....




لە شوێنێکی ئەم جیهانە فراوانە دارسێوێکی گەورە هەبوو، هەر لەهەمان ناوچەدا منداڵێکی بچکۆلانە هەبوو ڕاهاتبوو ڕۆژانە لە لای دارسێوە گەورەکە یاری دەکرد...بەسەر دارەکە هەڵدەگەڕا...سێوی دەخوارد...لە ژێر سێبەرەکەیدا دەخەوت.

هەر بۆیەش دارسێوەکە حەزی دەکرد لە گەڵیدا یاری بکات، ساڵان ڕابرد و منداڵەکە گەورە بوو، بۆیە نەدەهات لەگەڵ دارسێوەکەدا یاری بکات..

ڕۆژێك لە ڕۆژان منداڵەکە بەدڵ تەنگی هات بۆ لای دارسێوەکە... دارسێوەکە پێی وت: وەرە یاریم لە گەڵدابکە،

کوڕەکە وەڵامی دایەوە: من ئێستا منداڵ نەماوم وەکو جاران...ئێستا یاری لەگەڵ داردا ناکەم...شت و مەکی یاری کردنم پێویستە... پێویستم بە پارەیە بۆ کڕینیان.

دارسێوە گەورەکە وتی: بەداخەوە من هیچ پارە شك نابەم بۆ ئەوەی پێت بدەم، بەڵام دەتوانی سێوەکانم لێبکەیتەوە و لە بازاڕدا بیان فرۆشی و پارە بەدەست بهێنیت، بە پارەکەش شتومەکی یاری کردنی پێ بکڕیت.

منداڵەکە بەبیستنی ئەم قسانە زۆر دڵ خۆش بوو، هەستا بە لێ کردنەوەی سێوەکان و دارسێوەکەی بە دڵ خۆشی بەجێهێشت.

منداڵەکە چیتر نەهاتەوە بەلای دارسێوەکەدا دوای ئەوەی هەموو سێوەکانی لێکردەوە..

دارسێوەکە زۆر دڵ تەنگ بوو، ڕۆژێـك لـە ڕۆژان کوڕەکـە هاتـەوە ( کـە ئێـستاکە بۆتـە پیاوێکی تەواو؟ ) بۆ لای دارسـێوەکە، دارسـێوەکە خۆشـیەکی زۆر دای گـرت بـە بینینـی کوڕەکە... بۆیە پێی وت: وەرە یاریم لەگەڵدابکە؟

کوڕەکە وەڵامی دایەوە: کاتی ئەوەم نیە لە یـاری کردنـدا بـە فـیڕۆی بـدەم...پێوویـستە لەسەرم کار بکەم بۆ ئەوەی ڕۆزی بۆ خاو خێزانم پەیدابکەم، هەروەها دەمەوێت خانوێکیـان بۆ دروست بکەم بۆ ئەوەی تێیدا بژین... ئایا تۆ دەتوانی هاوکاریم بکەیت ؟؟

دارسێوەکە وەڵامی دایەوە: بەداخەوە من هیچ خانوێك شك نابەم، بـەڵام دەتـوانی لـق و چڵەکانم ببڕیتەوە بۆ ئەوەی خانوی پێدروست بکەی...

پیاوەکە زۆر دڵ خۆش بوو، بۆیە دەستی کرد بە بڕینەوەی لق و چڵی دارسـێوەکە و، بـە دڵ خۆشی ڕۆیشت... هەروەها دارسێوەکەکەش بەمە زۆر دڵ خۆش بوو...

پیاوەکە لەوکاتەوەی دارەکەی بڕیـەوە چـیتر نـە گەڕایـەوە بـۆلای دارسـێوەکە... بۆیـە دارسێوەکە زۆر خەمناك بوو و هەستی بە تەنیایی دەکرد.

ڕۆژێك لە ڕۆژەکانی هاوینێکی گەرمـدا پیاوەکـە گەڕایـەوە، بۆیـە دارسـێوەکە زۆر دڵ خۆش بوو، بۆیە پێی وت: وەرە یاریم لە گەڵدا بکە.

پیاوەکە وەڵامی دایەوە: ئێـستاکە پیر بوومەو دەمەوێت بچمە ناو دەریا و دەریاوانی بکـەم، ئایا تۆ دەتوانی هاوکاریم بکەیت و، بە لەمێکم بدەیتێ؟

دارسێوەکە وتی: داوای لێبووردنت لێدەکەم هیچ بەلەمێك شـك نابـەم، بـەڵام دەتـوانی قەدەکەم ببڕیەوە و بەلەمێکی لێ دروست بکەی و بچیتە ناو دەریا بۆ ئـەوەی تۆزێـك پـشوو بدەیت و تاوێك دڵت خۆش بکەیت.

پیاوەکە هەستا دەستی کرد بە بڕینەوەی قەدی دارسێوەکە و بەلەمێکی لێ دروست کرد و تاوەکو ماوەیەکی دوور و درێژ نەگەڕایەوە.

پاش چەندان ساڵ پیاوەکە گەڕایەوە بۆ لای دارسێوەکە.

دارسـێوەکە پێـی وت: داوای لێبووردنـت لێدەکـەم کوڕەکـەم چـونکە هـیچم نـەماوە

بتدەمێ...نە سێوم ماوە بیخۆیت...

پیاوەکە وەڵامی دایەوە: کێشە نیە.. چوونکە ددانی سێو خواردنم نەماوە...

دارسێوەکە وتی: نە قەدم ماوە پێیدا هەڵگەڕێی....

پیاوەکە وتی: ئێستا من پیر بوومە بۆ ئەمەشیان....

دارسێوەکە بە چاوی پڕ لە فرمێسك وەڵامی دایەوە : بە ڕاستی ئێستا من ناتوانم هیچ شتێکت پێبدەم، تاکە شتێك کە ئێستا مابێتم ڕەگە مردووەکانمە.

پیاوەکە وتی: من زۆر ماندووم دوای ئەو هەموو ساڵە.

دارسێوەکە وەڵامی دایەوە: کەواتە دارسێوی پیر باشترین شوێنێکە بۆ پاڵپشتی و حەسانەوەت.... وەرە وەرە بۆلام و کەمێك بحەسێوە لە گەڵمدا.

پیاوەکە دانیشت...بەڵام دارسێوەکە زۆر دڵ خۆش بوو و فرمێسکی خۆشی بە چاوەکانیدا دەهاتە خوارێ

براکانم.....

ئەمە سەرگوزشتەی هەریەکێکە لە ئێمە...دارسێوەکە نموونەی دایك و باوکمانە، کاتێك بچووکین حەز دەکەین لەگەڵ دایك و باوکماندا یاری بکەین،بەڵام کاتێك گەورە دەبین بەجێیان دێڵین و بەلایاندا نایەین، تەنها لە کاتێکدانەبێت کە پێویستمان پێیانە و تووشی کێشەیەك دەبین، بەڵام هەرچۆنێك بێت دایك و باوك ئامادەن هاوکاریمان بکەن بۆ ئەوەی دڵ خۆشمان بکەن...لە وانەیە وا هەست بکەی کە هەڵس و کەوتی منداڵەکە لە گەڵ دارسێوەکەدا زۆر دڵ ڕەقانە و نامرۆڤانە بوو؟ بەڵام بە داخەوە زۆربەمان بەم شێوەیە لەگەڵ دایك و باوکماندا هەڵس و کەوت دەکەین.

کەواتە پێش ئەوەی ڕۆژێك دابێت نە توانی بگەڕێیتەوە، ئەگەر دایك و باوکت لە ژیانندا ماون ( خودا تەمەنیان درێژبکات) ئەمە بە هەل وەربگرە و چاکەیان لە گەڵدا بکە، لە گفتوگۆکردن لە گەڵیاندا بتوانە خۆشەویستیان بەدەست بهێنە، بەڵام ئەگەر لە ژیاندانەماون و مردون، ئەوا شەو و ڕۆژ بۆیان لە خوا بپاڕێوە کە لە گوناحەکانیان خۆش بێت کە چۆن

ئێمـــەیان بەمنـــداڵی بـــە خێـــوكرد وە و شـــەو نخـــونی و ئازاریـــان لەگەڵـــدا چێـــشتووین،
((وَاخفِض لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ مِنَ الرَّحمَةِ وَقُل رَبِّ ارحَمهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرًا)) **الإسراء ٢٤**
واتە : باڵی میهرەبانی خۆتیان بۆ ڕاخەو ملکەچ بە بۆیـان، نـزا بکـەو بڵـێ: پـەروەردگارا ڕەحمیان پێ بکەو میهرەبان بە بۆیان، هەروەکو چۆن ئەوان ڕەحمیان بـە مـن کـردوو و منیـان پەروەردە کردووە بە بچووکی و منداڵی.

# سەرخەرەکە کارناکات



دوو کرێکار لای یەکێك لە کۆمپانیاکان کاریان دەکرد، کۆمپانیاکە ناردنی بۆ چاکردنی سەر بانی یەکێك لە باڵەخانەکان، دوای گەیشتنیان بە باڵەخانەکە بینیان لافیتەیەك هەڵواسراوە و لێ ی نووسراوە سەرخەرەکە ( مصعدەکە) کارناکات بۆیە کرێکارەکان کەمێك وەستان و بیریان کردەوە کە چی بکەن بەڵام دواتر خۆیان یەك لاکردەوە بە خێرایی سەرکەونە سەر باڵەخانەکە بە پیلیکانەکە لەگەڵ ئەوەش باڵەخانەکە لە چل قات پێکهات بوو، دەستیان کرد بە سەرکەوتن بەو هەموو کەرەستە پێویستەی هەڵیان گرتبوو بەرەو ئەو بەرزی یە بەڵام زۆر بە ئارەزوو تامەزرۆیی یەوە... هەر چۆنێك بێت و پاش ماندوو بوونێکی زۆر و ئارەق ڕشتنێکی زۆر و دانیشتنی زۆر لەرێگادا گەیشتنە ئامانجەکەیان، لێرەدا یەکێکیان ئاوڕی بەلای ئەوی تریاندا دایەوە و وتی: دوو هەواڵم پێ یە دەمەوێت پێتی ڕابگەیەنم....یەکێکیان خۆش و ئەویتریان ناخۆش

برادەرەکەی وتی: باشە با بە هەواڵە خۆشەکە دەست پێ بکەین

برادەرەکەی وتی: موژدەم بدەیە کە گەیشتینە سەر بانی باڵەخانەکە لە کۆتایی دا

برادەرەکەی دوای دەربڕینی خۆشحاڵی خۆی پێ ی وت : باشە ئەوا سەرکەتین ئەی هەواڵە نا خۆشەکە چی یە؟

برادەرەکەی بە تورەیی پێ ی وت: ئەوە ئەو باڵەخانە نی یە کە ئێمەی بۆ هاتووین...؟؟

چ لە ناوە ڕۆکی چیرۆکەکە فێر دەبین

بە داخەوە خوێنەری ئازیز زۆرکەس هەیە لەژیانیدا وەك ئەو دوو کرێکارە ژیان بەسەر دەبات....هەوڵدەدات و ماندو دەبێت ئارەق دەڕێژێت بەڵام لە کۆتایدا ناگات بە هیچ...بۆچی..؟ لە بەر ئەوەی ئەخشەی نە بووە پێش ئەوەی هەنگاو بنێت و بەرنامەی بۆ ژیانی خۆی بەوردی دانەناوە کە بە وەڵامی ئەم پرسیارە گرنگەی تێدا بداتەوە:

بە دیاری کراوی چیم دەوێت.....

چی بکەم بۆ ئەوەی دەمەوێت..؟

# ڕاستگۆبە لەگەڵ خۆتدا ژیان ڕاستگۆ دەبێت لەگەڵتدا....



ڕۆژێکیان کچێك هاتەوە بۆ لای ماڵی باوکی باسی گرانی ژیـان و نـەتوانینی هـەڵکردنی بەهەڵس و کەوتکردنی لەگەڵ ئەو کێشانەی ڕوو بە ڕووی دەبێتەوە.

بۆیە باوکی دەستی گرت و بردی بۆ چێشتخانەی ماڵەوە سێ مەنجەڵی بچکۆڵەی پـڕ لـە ئاو کرد و لەسەر ئاگری دانان دواتر لە مەنجەڵی یەکەم یەك دانە پەتاتەی تێکـرد..... و لـە مەنجەڵی دووەم یەك هێلکە....و لە مەنجەڵی سێ یەم یەك کەوچك قاوەی تێکرد....،

کـچەکەی بـەباوکی وت : باوکـە مـن هـاتووم بـۆلات بـۆ ئـەوەی کێـشەکانم بـۆ چارەسەربکەیت، خۆمن ئێستا برسیم نی یە منت هێناوە بۆ چێشتخانە..؟

باوکی وەڵامی دایەوە: کەمێك ئارام بگرە هاوکاریت دەکەم بۆچارەسەری کێشەکانت..؟

پاش کەمێك باوکەکە ئاگرەکەی ژێر هەرسێك مەنجەڵەکەی کوژاندەوە، و پرسـیاری لـە کچەکەی کرد ئایا چی بەسەرئاو هەرسێ مەنجەڵەکەدا هاتووە..؟

کچەکەی وتی: باوکە مەبەستت لەوە چی یە...!!

باوکەکە وتی: کچەکەم ئاوە گەرمـە کـە چـی بەسـەر هێلکەکـە وپەتاتەکـە و قاوەکـەدا هێنا..؟

کچەکەووتی: پەتاتەکە زۆر نەرم و بی هێز بووە

بەڵام هێلکەکە زۆر ڕەق توندو بێکەوە گوشراو بوو،

بەڵام قاوەکە توایەوە و ئاوەکەی کرد بە قاوە

لێرەدا باوکەکە بە کچەکەی وت: ئاوە کوڵاوەکە تەواو وەك ژیان وایە هەموومان دەچینە ناوی لەگەڵ ئەوەی ئاو هەر ئاوە بەڵام هەریەکەمان بە شێوەیەکی جیاواز کاری لێدەکات، هەمانە وەك پەتاتەوایە توانی بەرگری کردنی ناخۆشی یەکانی ژیانی نی یە،وبێ هێزی دەکات و نەرم و بێ هێزی دەکات.

هەشمانە وەکو هێلکە وایە بەهێز دەبێت بە گرانی و ناخۆشی یەکانی ژیان و ڕەق تر دەبێت.

هەشمانە وەکو قاوە وایە توانای کارلێك کردنی لەگەڵ ژیان هەیە و گۆڕانکاری بەسەردا دەهێنێت.......

پێش ئەوەی بیر لە چارەسەرکردنی کێشەکان بکەیتەوە پێویستە لەسەرت یەکەم جار بەرهەڵستی بکەیت....

ئایا ئێستا تۆ پەتاتەکەی....یان هێلکەکەی.....یان قاوەکەی...........

# چۆن بژی نەك چەند بژی.....؟؟



دەگێڕنەوە لەسەردەمی فەرمان ڕەوایەتی فیرعەونی ستەم كاردا منداڵێكی بچووك هەبوو ناوی عەلی بوو، كاتێك جەژن هات عەلی نەی زانی تام و خۆشی جەژن بچێژێت، عەلی هەمیشە (بە دڵ تەنگی و تەنیایی) دەژیا چونكە هەستی بە زوڵم وستەمی فیرعەون دەكرد لەگەڵ خەڵكی بێدەسەڵات و چاكە خوازدا،هەمیشە دەی بینی ستەم و خراپەكاری فیرعەون زیاد دەكات، خەڵكیش دەستە وەستان دادەنیشن و هیچیان نەدەكرد لەگەڵیدا، و دەیان وت چونكە ئەگەر بەرەنگاری فیرعەون ببنەوە ئەوارڕووبەڕووی مەرگ دەبینەوە، هەربۆیە ژیانی سەرشۆڕی و ژێر دەستیان هەڵبژاردبوو. بۆیە عەلی هەمیشە ئاواتە خوازی ئەوە بوو كە زوو گەورەبێت بۆ ئەوەی تۆڵە لە فیرعەونی ستەم كار بسەنێتەوە. هەر بۆیە لەیەكەم ڕۆژی جەژنـدا عەلی چوو بۆ لای پیاوە چاكە خوازەكەی شارەكەیان كە زۆری خۆش دەویست،كاتێك عەلی گەیشتەماڵی پیاوە چاكە خوازەكە دیارنەبوو بۆیە پرسیاری لەدایكی كرد كە لە كوێ یە، دایكی وەڵامی دایەوە: كە ئەو مردووە، عەلی دەستی كرد بە گریان، دوای ئەوەی عەلی هەواڵی چۆنیەتی مردنەكەی لە دایكی پرسیار كرد،دایكی وتی : ئەو چوونكە پشتیوانی لە مافی پیاوێكی هەژار كرد دژی فیرعەون، هەر بۆیە فیرعەون بڕیاری كوشتنی دەركرد... عەلی زۆر دڵ تەنگ بوو زۆر بۆی گریا. لەڕێگادا كە دەڕۆیشت زۆر سەرسام بوو چونكە بینی دایكی پیاو چاكەكە نەدەگریا و هیچیش دڵ تەنگ نەبوو بۆ كوڕەكەی، لە كاتی ڕۆیشتنی بە ڕێگادا و بیر كردنەوەی لەو سەرگوزشتەیە، بینی ئەوا

پیاوێك بەرخێك ئامادەدەكات بۆ سەربڕینی لە یەكەم ڕۆژی جەژندا، لەبەرامبەر بەرخەكەش گوێ درێژێكی بینی زۆر بەسەرسامی تەماشای بەرخەكەی دەكرد............بەرخەكە بە گوێ درێژەكەی وت: بۆچی ئاوەها تەماشام دەكەیت..........؟!من بە بەرخی دەمرم بەڵام ئامەوێت بە گوێ درێژی بژیم......؟؟؟

لێرەدا عەلی وەلامی پرسیارەكەی دەست كەوت، ئەویش: بۆچی دایكی پیاو چاكەكە بۆ كوڕەكەی نەدەگریا...؟؟؟!!!

# قسە لەسەر سەرنجامی شتەكان مەكە



جارێكیان پیاوێكی بەتەمەن لەگەڵ كوڕە تەمەن بیست و پێنج ساڵانەكەی لەناو شەمەندەفەر دانیشت بوون.

خۆشی یەكی گەورە و پرسیاری زۆر لەسەر ڕووی كوڕە گەنجەكە دەدرەوشایەوە كەلە تەنیشت پەنجەرەكە دانیشت بوو.

كوڕە گەنجەكە دەستی لەپەنجەرەكە بردە دەرەوە بۆیە هەستی بە ڕۆیشتنی هەوادەكرد لە ژێردەستی دا بۆیە هاواری كرد: باوكە سەیركە هەموو دارەكان بە دواماندا دە ڕۆن !!

پیاوە پیرەكە زەردەخەنەی دەهاتە سەر لێوەكانی و لەگەڵ خۆشی كوڕەكەی بەردەوام بوو.

لەتەنیشت ئەوانیش ژن و مێردێك دانیشت بوون گوێیان لەو كەین و بەینەی نێوان ئەو كوڕو باوكە گرتبوو. هەستیان بەكەمێك شەرم دەكرد كە چۆن كوڕێكی گەنجی تەمەن بیست و پێنج ساڵە بەشێوەی منداڵ هەڵسوكەوت دەكات !!!

جارێكی تر كوڕە گەنجەكە هاواری لێ هەڵسا: باوكە، سەیری ئەو گۆمە بكە ئەوهەموو

گیاندارەی تێدایە،سەیری....هەورەکان لەگەڵ شـەمەندەفەرەکە دەڕۆن، بۆیـە سەرسـوڕمانی ژن و مێردەکە بەردەوام بوو جارێکی تر لە قـسەکانی کوڕە گەنجەکە.

باران بارین دەستی پێ کرد، و تنۆکە بارانەکان دەکەوتنە سەر دەستی کوڕە گەنجەکە، کە دەم و چاوی لە خۆشی دەگەشـایەوە، جـارێکی تـر هـاواری کـرد، باوکـە سـەیرکە بـاران دەبارێت، سەیرکە باران بەردەستم کەوت سەیرکە باوکە!!

لێرەدا ژن و مێردەکە چیتر توانایان نەما بەبێ دەنگی خۆیان ڕابگـرن بۆیـە پرسـیاریان لـە پیاوە پیرەکە کرد: بۆچی کوڕەکەت نابەی بۆلای دکتۆر بۆ وەرگرتنی چارەسەر بۆی..؟

لێرەدا پیاوە پیرەکە وتی: ئێمە ئێستا لە نەخۆشخانە دێینەوە، لە چارەسەرکردن چاوەکانی کوڕەکەم، کە ئەمە یەکەم جاریەتی لە ژیانی دا چاوەکانی دنیا ببینێت...!!

بۆیە هەمیشە لە یادت بێت: قسە لەسەر سەرنجامی شتەکان مەکە تاکو سـەرجەم شـتەکان نەزانی.....!!

## من ئەو ئەناسم...!!



بەردەوام هەموو ڕۆژێك دەچوو بۆنان خواردنی بەیانی لەگەڵ خیزانی لە خانەی چاودێری کردنی بەساڵاچوان لەگەڵ ئەوەی تەمەنی نزیکی هەشتا ساڵ بوو بوەوە، کاتێك پرسیاریان لێ کرد دەربارەی چوونی خێزانی بۆ خانەی چاودێری بەساڵاچوان؟ماوەیەکە لەوێ یە تووشی نەخۆشی زەهامیر ( لەبیر چوونەوە) بووە.

پرسیارم لێ ی کرد: ئایا خێزانەکەت تووشی دڵە ڕاوکێ دەبێت ئەگەر لە کاتی دیاری کراو ئامادە نەبیت ؟ پیاوەکە وەڵامی دایەوە و وتی: ئەو ئێستا وای لێهاتووە نا زانێت من کێم... ئەو پێنج ساڵ دەبێت من نا ناسێت؟ بەسەر سوڕمانەوە لێیان پرسی:لەگەڵ ئەوەش کە نات ناسێت و نا زانێت تۆ کێ ی کەچی هەتا ئێستاش هەموو بەیانیان لە کاتی خۆیدا دەچیت بۆ نان خواردنی بەیان لە گەڵیدا؟ پیاوەکە بە پێکەنینەوە وەڵامی دامەوە کە بەدەستەکانی دەستی دەکوشیم وتی: ئەو نازانێت من کێم بەڵام من دەزانم ئەو کێ یە..!!

زۆرم لە خۆم کرد کە فرمێسکەکانم بشارمەوە هەتاکو ڕۆیشت و شوێنەکەی بە جێ هێشت، دواتر بەخۆم وت: ئەوە ئەم جۆرە خۆشەویستیەیە کە ئێمە پێویستمان پێ یەتی.

مرۆڤ کانزایە بە تەمەڵی ژەنگ هەڵ دێنێت...درێژ دەبێتەوە بە هیوا...دەپرکێتەوە بە ئازار و ناخۆشی یەکان

# زانیارییە بکوژەکان لەخۆت لادە



لە یەکێك لە زانکۆکانی کۆلۆمبیا یەکێك لە قوتابییەکان ئامادەی وانەیەك بوو لــە بابــەتی بیرکاری.. لە پشتەوەی هۆڵەکە دانیشت و بەئارامی خەوی لێ کەوت.. لە کۆتایی وانەکــە بە دەنگی قوتابی یەکان خەبەری بۆوە.. تەماشای تەختە ڕەشەکەی کــرد بــینی مامۆســتاکەی دوو پرسیاری لەسەر نوسیوە بــە خێرایــی نوســیوە و لــە هۆڵەکــە چــووە دەرەوە و کاتێــك گەڕایەوەماڵەوە دەستی بە بیرکردنەوە کرد بۆ شیکارکردنی ئەم دوو پرسیارە..

ئەو دوو پرسیارە زۆر گران بوون بۆیە ڕووی کردە کتێبخانەی زانکــۆ و چــەند سەرچــاوە یەکی پێویــستی وەرگرت.. دوای چوار ڕۆژ توانی پرسیاری یەکەم شیکار بکات..

ئەولەو مامۆستایە زۆر بێ زار و دڵتەنگ بوو کە ئەم ئەرکە قورسەی داوە بەسەریاندا !!

بۆیە چوو بۆ لای و پێ گوت :- ئەی دکتــۆر چــوار ڕۆژە خــەریکی شــیکارکردنی تــەنها پرسیارێکم وەلە چوار لاپەڕەدا شیکارەکەم نووسیوە..

مامۆستاکە بەسەرسورمانیەوە گــوتی : ئــەو دوو پرســیارەش کــە لەســەر تەختــە ڕەشــەکە نووسیبوم نموونە بوون بۆ قوتابیەکانم نووسیبو لەو پرسیارانەی کە زانــست نــەیتوانیوە تــاکو ئێستا شیکاریان بکات !!..

بێ گومان ڕازی بونی ئەرێنی وای لە زۆرێك لە زانایان کردووە بیرکردنــەوە تەنانــەت لــە هەوڵدان بۆ شیکارکردنی ئەم پرسیارە..

ئەگەر ئەم قوتابی یە بە خەبــەر بوایــە و گوێــــیی ڕاڤــە کردنــی دکتــۆر بوایــە بــیری لــە شیکارکردنی ئەم پرسیارە نەدەکردەوە. بەڵام ڕەنگە خەوێکی سوود بەخش بوبێت...

تاوەکو ئێستاش ئەم پرسیارە لە چوار پەڕەدا نمایش کراوە لەو زانکۆیە.

# بۆ چونێك لە نێوان وەرزشوانانی ڕاکردن



پەنجا ساڵ بەر لە ئێستا بۆ چونێك هەبوو لە نێوان وەرزش وانانی ڕاکردن..
کە ئادەمیزاد ناتوانێك ماوەی میلێك ببڕێت لە کەمتر لە چوار خولەکێك..
وە هەر کەسێك هەوڵ بدات ئەو ژمارە بەزێنێت ئەوا دڵی دەتەقێت !!
بەڵام یەکێك لە وەرزش وانان پرسیاری کرد ئاخۆ کەس هەوڵی داوە و دڵـی تـەقیوە، لـە وەڵامی ئەوان دا وتییان نەخێر کەس نەبووە ؟؟
بۆیە دەست بە جێ دەستی کرد بەمەشق و ڕاهێنان تاکو توانی ژمارەکە ببەزێنێ ئـەو ماوەیـە ببڕێت لە کەمتر لە چوار خولەك..
لەسەرەتادا خەڵکی وایان زانی کابرا شێت بووە یان کاتژمێرەکەی دروست نـی یـە بـەڵام دوایی ئەوەی بینیان باوەڕیان پێ کرد و هەر لەو ساڵەدا زیاتر لە سـەد وەرزشـەوان توانیـان ئەم ژمارە ببەزێنن ؟؟
بێ گومان ڕازی بونی ئەرێنی وای لێ کردبوون ئەتوانن هەوڵبدەن لە پێشتر..
وە کاتێك ئەم قایل بوونە ئەما توانیان داهێنان بکەن..

# ئەگەر تاکە نەعلێکت لێ کەوت...؟؟



تەنها تاکێك...یان بۆ نموونە تاکێکیانت لێ ون بوو تەنها تاکێك..؟؟ تۆ چی لـە تاکەکـەی تریان دەکەیت..؟

دە گێڕنەوە جارێکیان ( گاندی) زۆر بە خێرایی ڕای دەکرد بۆ گەیشتن بە شەمەندەفەر لە کاتێکدا دەستی کرد بوو بە ڕۆیشتن،لە کاتی سەرکەوتنیدا بۆ سەر شـەمەندەفەرەکە تاکێـك لە نەعلەکانی لە یەکێك لە پێیەکانی کەوتە خوارەوە،بۆیە بـێ دوو دڵـی هەسـتا بـە دانـانی تاکەکەی تریـان و فـڕێ دانـی بـۆلای تاکەکـەی تریـان بـۆ سـەر هێڵـی شـەمەندەفەرەکە، برادەرەکانی سەریان سوڕما لەو کارەی گاندی.

بۆیە پرسیاریان لێ کرد

چ شتێك وای لێ کردی کە ئەم کارە بکەی؟

بۆچی تاکە نەعلەکەی تریانت فڕێ دایە لای تاکە کەوتووەکە؟

گاندی دانا وەڵامی هاوڕێ کانی بەم شێوەیە دایەوە، حەزم کرد ئەو هەژارەی نەعلـەکانم دەبینێتەوە هەردوو تاکەکەیان ببینێتەوە بۆ ئەوەی بتوانێت سوودیان لێ وەر بگرێـت! چـونکە ئەگەر تەنها تاکێکیان بدۆزێتەوە هیچ سوودێکی لێ نابینێت، هەروەها منیش نا توانم سوود لە

تاکەکەی کەیان ببینم...؟

ئایا چ لەم سەرگوزشتەیە فێر دەبین

پێویستە دەروونی خۆمان لەو سەرگوزشتەیە واڕابێنین :

هەرکاتێك شتێکمان لەدەستدا لە وانەیە بۆ یەکێکی تر بچێت و خێرو خۆشی بۆ بەرێت؟

بۆیە با بە دڵخۆشی ئەوان دڵ خۆش بین و بەناخۆشیشیان دڵ تەنگ بین؟

ئایا دڵ تەنگ بوونمان ئەوەی لەدەستمان داوە بۆمان دە گێڕێتەوە...؟!

# فیل و گوریسێکی باریك



ڕۆژێك بیرم لە گیانداری فیل دەکردەوە، و لە پڕێك بیرۆکەیەك ڕای گرتم سەرسام بوم ئەمەش ڕاستی یەکە ئەم بونەوەرە مەزنانە بە ستراونەتەوە بە هۆی گوریسێکی باریکەوە کە لە قاچی پێشەوەی فیلەکەوە پێچراوە لەم باخچەی ئاژەڵانە، نەزنجیری گەورەو نە قەفەزی تێدا نیە.. جێگەی سەرنجدانە کە فیل زۆر بە ئاسانی دەتوانێ لە کۆتە هەرکاتێ بیەوێ خۆی ڕزگار بکات بەڵام بە هۆی شتێك ئەو کارە ناکات : ڕاهێنەری فیلەکەم لە نزیك فیلەکەوە بینی و لێم پرسی : بۆ چی ئەو گیاندارە گەورە و زەبەلاحانە لە شوێنی خۆیان وەستاون و هەوڵی ڕاکردن نادەن ؟

ڕاهێنەرەکە وەڵامی دایەوە : باشە کاتێك ئەو گیاندارە مەزنانە تازە لە دایك بوون زۆر لە ئێستا بچوکتربوون، بە هەمان قەبارەی گوریسی ئێستا دەمانبەستنەوە. بێ گومان ئەو کۆتانە – لەتەمەنەدا – بەس بوون بۆ بەستنەوەیان ئەو گیاندارانە گەورە دەبن و پێ یان وایە ئێستاش ناتوانن کۆت و بەندەکانیان بکەنەوە و خۆیان ڕزگار بکەن بەڵکو لەسەر ئەو بۆچوونەیان دەمێننەوە کە گوریسەکە کۆتی کردوون و بۆیە هەرگیز هەوڵ نادەن خۆیانی لێ ڕزگار بکەن، زۆر سەرم سوڕما بوو – ئەم گیاندارانە – کە خاوەن بازوێەکی وەهان دەتوانن قورساتی زۆر هەڵبگرن – بە ئاسانی دەتوانن لە کۆت و بەندانە ڕزگار بن، بەڵام پێ یان وایە ناتوانن بۆیە لە جێگەی خۆیان ناجولێن وەکو گیانداری فیل زۆرێك لە ئێمە بەم

شێوەیەین ڕێ دەکەین لە ژیاندا ڕازی بووین بە شتێك کە پێمان وایە ناتوانین هیچی تر بـەین یاخود شتێ بگۆڕین و بۆیە بە سانایی پێمان وایە ناتوانین ئەم کارە ئەنجام بدەین، یاخوا ڕۆژێك لە هەڵمان دا و بەڵام سەرنەکەوتین.

هەوڵدە شتێ دروست بکەی.. ژیانت بگۆڕە بە شێوەیەکی ئەرێنی و بـە شـێوازێکی ئـەرێنی زۆر ڕازی بوونی ئەرێنی لە ژیانماندا هەیە کە دەیانکەین بە ( مۆمی شکـست خواردن.. )

زۆر جار گوێ بیستی وشەی : نەستەم، قورس، ناتوانم... دەبین

ئەمەش تەنها ڕازی بوونی ئەرێنی یە و زۆر دوورە لە ڕاستی یەوە..

بەڵکو مرۆڤی (چالاك )، ( پشت بە خوا بەستوو ) دەتوانێ بـە ئاسـانی خـۆی لـێ ڕزگـار بکات...

کەواتە بۆ چی ئەم ڕازی بوونە ئەرێنی یانە نەشکێنن بەویست و ئیرادەیەکی پۆڵـایین و لـەو میانەوە ڕێبازمان بەرەو لوتکە ببرێن.

## بەڕاستی ئەمەیە ڕازی بوون..



دەڵێن کۆمپانیایەکی فرۆشتنی کەرەسەی خواردەمەنی بەفرگرێکی گەورەی هەبوو...

ڕۆژێك لە ڕۆژان کرێکارێك چووە ناو بەفر گرەوەکەوە... کە لە ژوورێکی گەورە و فراوان پێك هاتبوو.. کرێکارەکە چووە ناو بەفر گرەوەکەوە بەمەبەستی بەتاڵ کردنی ئەو سندوقانەی کە لە ناو بەفر گرەکە هەبوو... لەناکاو دەرگاکە لەسەر کرێکارەکە داخرا... چەند جارێك لە دەرگای دا و کەس لێی نەکردەوە... ئەو ڕۆژەش کۆتایی دەوام بوو لە کۆتایی هەفتە... چونکە دوو ڕۆژی ئایندە پشوو بوو... بۆ یە پیاوەکە وای زانی تازە لەناو دەچێت... کەس نی یە گوێ بیستی لە دەرگادانی ئەو بێ !!! دانیشت چاوەڕێی چارەنووسی دەکرد...

دوای دوو ڕۆژ فەرمان بەرەکان دەرگاکەیان کردەوە... بینیان کرێکارەکە مردووە... لە تەنیشتیەوە پارچە کاغەزێك هەیە... تیایدا نوسرا وە... بەر لە مردنی هەستی بە چی

کردووە... بینیان نوسیویەتی...( ئێستا کە من لە ناو ئەو بەفر گرە دابەند کراوم... هەست دەکەم دەست و پێیەکانم وا خەریکە دەی بەستێت و لە جوڵە دەکەون و هەست دەکەم ناتوانم بجوڵێم... وا خەریکە لە سەرمان ڕەق دەبمەوەو دەمرم... ) نوسینەکە بەرە بەرە لاواز بوو بوو ، تاکو وای لێ هاتبوو خەتەکە زۆر لاواز بوو.. تا ئەو کاتەی پچڕا بوو...

جێگەی سەرسامی یە کە بەفرگرەکە کوژابۆووە و بە تەزووی کارەباوە نەگەیەنرابوو !!

بە ڕای ئێوە کێ ئەو پیاوەی کوشتووە ؟؟

بێجگە لە (بیر و ئەندێشە ) یەك نەبێ کەتیایدا ژیاوە... ئەو پێ ی وابووە مادام لە ناو بەفرگرە دایە کە واتە کەش و هەواکەی ساردە و پلەی گەرما لە ژێر سفرەوەیە.. و بێ گومان ئەو دەمرێت... ئەم بیر و بۆ چوونە وای لێ کردووە بە ڕاستی ئەو کەسە بمرێت ...!!

بۆیە داواتان لێ دەکەم مەهێڵن بۆ چونی نەرێنی و بیرکردنەوەی هەڵە لە خۆمان فەرمانڕەوابێت لە ژیانماندا... زۆر لە خەڵکی دەبینن دەستەوسانن لە ئەنجامدانی کارێك لەبەر ئەوەی پێ یان وایە ئەوان بێ هێزو لاوازن و نەتوانا و متمانەیان بە خۆیان نییە.... لە ڕاستی لەوانەشە بە تەواوی پێچەوانەی ئەمە بێت...

# چۆن زەردەخەنە وێنا بکەین..؟



کچێکی بچکۆلانە کە تەمەنی لە شەش ساڵان تێپەڕی نەدەکرد پاکەتە کلینسی لەسەر شەقامەکان دە فرۆشت،بەسەر دەستە بچووکەکانی پاکەتی کلینسی بەنا فرۆشیاراندا دەگێڕا.

چاوی بە ئافرەتێك کەوت دەگریا، چەند چرکەیەك بەرامانەوە لەبەردەمی وەستا، ئافرەتەکە چاوی بەرەو کچۆڵەکە هەڵبڕی و فرمێسك ڕووی داپۆشی ، بۆیە کچۆڵەکە بەزەردە خەنەیەك کە لە قوڵایی دڵە پاکەکە ی هەڵقوڵا بوو کلینسێکی دا بە ئافرەتەکە و بە جێ ی هێشت پێش ئەوەی ئافرەتەکە بتوانێت نرخی کلینسەکەی بداتێ، پاش ڕۆیشتنی چەند هەنگاوێك ڕووی بەرەو ئافرەتەکە وەرگێڕا و بەدەستە بچکۆلانەکانی ئاماژەی بۆ ئافرەتەکە کرد، کە هەتا ئەو کاتەش زەردەخەنەکان ڕووی بە جێ نەهیشت بوو.

دوای ئەوە ئافرەتەکە کەوتە بیر کردنەوە، پاشان مۆبایلەکەی لە باخەڵی دەرهێنا و نامەیەکی نووسی و ناردی(( داوای لێ بووردنت لێ دەکەم....تۆ خاوەن حەقی!!!!)).

ئەو نامەیە بەدەستی پیاوەکەی گەیشت،کە لە چێشتخانەیەك بە دڵ تەنگی و خەمباری دانیشت بوو!!!

دوای ئەوەی نامەکەی خوێندەوە، زەردەخەنەیەکی کرد، هەستا ( ٥٠) جونەیهی دا بە

شاگردەكە،لەگەڵ ئەوەی پارەكەی تەنا ( ٥ ) جونەیهی دەكرد!!!

لەو كاتەدا شاگردەكە زۆر دڵخۆش بوو بەو دەست كەوت و ڕۆزیی یەی كە بە هیچ شێوەیەك چاوەڕوانی نەدەكرد، بۆیە لە چێشتخانەكە چووە دەرەوە، بەرەو ڕووی ئەوئافرەتە ڕۆیشت كە لەسەر شەقامەكە پەرۆیەكی ڕاخستبوو شیرنەمەنی لەسەر دەفرۆشت، بایی (١) جونەیهی شیرنەمەنی لێ كڕی و (٢٠ ) جونەیهی وەكو خێر بۆ دانا، بەدەمی بە زەردەخەنەوە بەجێ ی هێشت!!

چاوەكانی پیرەژنە شیرینی فرۆشەكە بە بینینی (٢٠ ) جونەیهی یەكان وشك بوو بوون، بۆیە بە دەم و چاوێكی گەش و دڵێكی سەماكار لە خۆشیان هەستا سەرپێ، و دەستی كرد بە پێچانەوەی شیرینیە سادەكەی، و چوو بۆلای گۆشت فرۆشێك بۆ ئەوەی پارچە گۆشتێكی لێ بكڕێت و بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە خواردنێكی بەتام بۆ كچەزاكەی ئامادەبكات، و چاوەڕوانی هاتنەوەی بێت،چونكە ئەوەی لە ژیانیدا هەیێت تەنها ئەو كچە زایەیەتی، بۆیە خواردنی بۆ ئامادەكرد و هەمان ئەو زەردەخەنەی لەسەر ڕووی بوو كە بووە هۆی پەیداكردنی گۆشت بۆ خواردنی...پاش چەند خولەكێك دەرگاكە كرایەوە، كچە كلینس فرۆشە بچكۆلانەكە وەژوور كەوت،بە دەم و چاوێكی گەش و زەردەخەنەیەكی جوانی....منداڵانەی بێگەرد، دەم و چاوی ڕووناك كردوە!!!

پێغەمبەر ( درودی خوای لەسەربێت) دەفەرموێت (( زەردەخەنەت بەڕووی برایەكەت چاكەیە)).

ڕاتان چی یە هەریەك لە ئێمەش ئەو منداڵە چی كرد ئێمەش وەها بكەین؟

چی دەبێت ئەگەر هەریەك لە ئێمە وێنای زەردەخەنە لە دڵەكانمان بخەینە سەر ڕووی خەمباران؟

ئەگەر بمانەوێت وێنای زەردەخەنە بكەین بە قسەیەكی باش ؟

هەوڵ بدەین بە سڕینەوەی فرمێسكی هەڵوەریوو لە دڵێكی پڕ لـ ئازار!

بە خێرێکی کەم بۆ خاوەن پێداوویستە نەدارەکان،کە توانای کڕینی ئائێکیان نی یە!

بە کڕینی دیاری یەك بۆ نەخۆشێك کە لەبەر نەخۆشی توانای هاتنە دەرەوەی نی یە!

بە تەلەفۆ ن کردنێك بۆ هەواڵ پرسینی خزم و کەسە نزیکەکانت!

بەدەست هێنان بەسەری هەتیوێك، کە وەکو بێچووە باڵندەیەك خۆی دەبینێت لەبەردەم ڕەشەبادا!

ڕێگاو شێوازی زۆر هەیە کە ناتوانین دەست نیشانیان بکەین و بیان ژمێرین،کە دەتوانین لە ڕێگایانەوە وێنای زەردەخەنە بکەین لەسەر ڕووی خەڵکانی تردا....

لە نێو خەم و خەفەتەکانمان و وێناکردنی زەردەخەنە لەسەر دڵەکانماندا.

تەنها بەبیرکردنەوە لەو هەموو بە خششە گەورانەی کە خوای گەورە پێ ی بە خشیووین.....

تەنها بەوەی کە نارەزای بوونی خۆمان دەرنەبڕین لەو هەموو شانەی بەسەرماندا تێپەڕیووە.....

ئەگەر زەردەخەنەت خستە سەر ڕووخسارت ئەوسا کە هەموو دنیا بە ڕووناکی دەبینیت...!!

# پاشا و سێ وەزیرەکەی ؟؟



ڕۆژێك لە ڕۆژان پاشا سێ وەزیرەکەی بانگ کرد و، داوای لە هەریەکێکیان کرد کە توورەکەیەك ( کیسەیەك ) بەن و بڕۆن بۆ ناو باخ و باخاتی کۆشك، هەریەکەیان توورەکەکەی پڕبکات لە باشترین میوەی جۆراو جۆر، هەروەها داوای لێکردن کە لە کارەکەیاندا پاڵپشتی و یارمەتی لەکەس وەرنەگرن، وەزیرەکان سەریان سوڕما لە داوا کاری پاشایان، بۆیە هەریەکەیان توورەکەکەی دەست دایەو بەرەو باخی کۆشك ڕۆیشتن.

وەزیری یەکەم : پێداگری دەکرد کە پاشا لەخۆی ڕازی بکات بۆیە هەستا بە کۆکردنەوەی باشترین و نایابترین میوە و بەروبووم، بەردەوام بوو هەتا گونیەکەی پڕکرد لەم میوە باشانە.

بەڵام،

وەزیری دووەم: دڵنیا بوو لەوەی کەپاشا پێویستی بە میوە نیە و نایەوێت، هەروەها چاودێری چاك و خراپی میوەکانیش ناکات، بۆیە دەستی کرد بە کۆکردنەوەی میوە، بەبێ گوێ پێدان و بەتەمبەڵی، میوەی باش و خراپی لێك جیانەدەکردەوە، بەردەوام بوو تاوەکو گونیەکەی لێ پڕکردن.

بەڵام،

وەزیری سێیەم: گومانی ئەوەی نەبرد کە پاشا گرنگی بە ناوەڕۆکی گوونیەکان دەدات

لەبنچینەدا، بۆیە هەستا بە پڕکردنی گوونیەکەی لە گیا و گۆڵ و پووش و پەلاش و گەلای دار، هەتا گوونیەکەی لێ پڕ کردن.

بۆ ڕۆژی دواتر پاشا داوای کرد هەرسێك لە وەزیرەکان بە گونیە کانیانەوە و ئەوشتانەی کەکۆیان کردۆتەوە بێن بۆ لای.

کاتێك وەزیرەکان هاتن بۆ لای پاشا، پاشا فەرمانی بە سەربازەکانی کرد، کە هەرسێ وەزیرەکان ببەن بۆ بەندیخانەو بەندیان بکەن، هەریەکەیان بە جیا لە ژوورێکی تەنیایی لە گەڵ گوونیەکانیان و ئەو شتانەی کە کۆیان کردۆتەوە، بۆ ماوەی سێ مانگ، لە بەندیخانەیەکی دوور، کە بەهیچ شێوەیەك دەستی هیچ کەسێکیان پێنەگات جا ئەو کەسە هەر پلەو پایەیەکی هەبێت،هەروەها خواردن و خواردنەوەشیان لێ قەدەغەبکرێت.

وەزیری یەکەم: دەست دەکات بەخواردنی باشترین میوە کەکۆی کردبووە وە تاوەکو سێ مانگەکە تەواو دەبێت.

بەلام،

وەزیری دووەم : ژیانی بەنا گوشادی کەم توانایی بەپشت بەستن بە میوە باشەکان کە کۆی کردبووە وە بەست تاوەکو سێ مانگە کە تەواو بوو.

بەلام،

وەزیری سێیەم : لە برسانا مرد پێش ئەوەی مانگی یەکەم کۆتایی پێ بێت.

بەم شێوەیە پرسیار لە خۆت بکە تۆ لە کام جۆری لە وەزیرەکان؟؟؟

لێستا تۆ لە باخ و باخاتی دوونیا دایت ؟؟

تەواو سەربەستیت هەیە، لە کۆکردنەوەی چاك و خراپ دا، بەلام سبەی کاتێك (( پاشای پاشایان)) فرمان دەکات بە کە بەندبکرێیت لە ناو گۆڕەکەتدا، لەو ژوورە تەنگ و تاریك دا بەتەنیایی.

لێرەدا چ گومانێك دەبەیت، کە چ شتێك بە کەلکت بێت، جگە لەو کردەوە چاکانەت

کەلە ژیانی دوونیاتدا کۆتکردبوونەوە؟؟؟

پوختەی چیرۆکەکە.........

ئەمڕۆ کۆتا ڕۆژی تەمەنتە کە لە ژیاندا ماووتە؟؟

هەمیشە پێداگری بکە لەوەی کە کردەوەی چاك و باش کۆبکەیتەوە لە سەرزەوی، بۆ ئەوەی گوزەرانی باش پێ ببەیتە سەر، بەوەی بە دەستەکانی خۆت بەدەستت هێناوە لە ناو گۆڕ و لە دوارۆژدا....

لە بەرئەوەی پەشیمانی دادت نادات دواتر...؟؟؟

# تەنها خولەکێك.....؟؟



لەبەردەم پەنجەرەی بڕینی بلیتی سەفەر کردن بە پاس وەستابووم بۆ بڕینی بلیت بۆ شارێك کە ٣٣٠کم لە شارەکەی خۆمەوە دوور بوو، لەبەردەمدا ئافرەتێکی تەمەن ٦٠ساڵی بوو کە گەیشتە بەردەم پەنجەرە بۆ بڕینی بلیت، گفتوگۆکردنی درێژەی کێشا لەگەڵ کارمەندەکە , لەکۆتاییدا کارمەندەکە پێی وت : خەڵك چاوەڕێیانە , بەیارمەتیت کەمێك دوورکەوە لای پەنجەرەکە , ئافرەتەکەش هەنگاوێك دوورکەوتەوە بۆ ئەوەی ڕێگا بۆ خەڵکی تربکاتەوە , پێش ئەوەی بلیتی خۆم ببڕم پرسیارم لەکارمەندەکە کرد کە کێشە چی یە , وتی : ئەو ئافرەتە تەنها پارەی بڕینی بلیتی لایە و پارەی چوونە ژوورەوەی وێستگەی لانی یە کەیەك بۆرۆیە , دەیەوێت چاوەڕێی پاسەکەبکات لەدەرەوەی وێستگەکە , ئەمەش قەدەغە یە. پێم وت : ئەمە بۆرۆیەك تکایە بلیتەکەی بۆببڕە. کەمێك گەڕامە دواوە و ڕێگام بۆئافرەتەکە کردەوە بۆئەوەی بگەڕێتە ناوڕیزەکە , دوای ئەوەی کارمەندەکە بانگی کرد. ئافرەتەکە بلیتەکەی بڕی و لە تەنیشت ڕێگاکە وەستا، وەکوئەوەی چاوەڕێی من بکات , گومانم بۆئەوە چوو کە بیەوێت سوپاسم بکات , بەڵام وای نەکرد , بەڵکو چاوەڕێی ئەوەی کرد بۆ ئەوەی دڵنیابێت کە ئایامنیش بلیتەکەی خۆم دەبڕم و ڕێبکەم بەرەوشوێنی پاسەکان بۆڕۆیشتن , کاتێك گەیشتمە لای بە ئاماژە فەرمانی پێکردم کە ئەمە هەڵبگرە... ئاماژەی بۆ

جانتاکەی کرد. کارێکی لـەم شـێوەیە بـەلای ئەوخەلکانـەی بەبەرامبەرکاردەکـەن شـتێکی زۆرسەیرە. بەبێ بیرکردنەوە جانتاکەیم هەلگرت و بەیەکەوە بەرەو پاسەکە بـەڕێ کـەوتین, ئەمەش شتێکی ئاسایی یە کە کورسیەکانمان لە تەنیشت یەکەوەیە چوونکە , ئـەو پـێش مـن بلیتی بڕیوە. هەولمدا لای پەنجەرەکە دابنیشم بۆ ئەوەی چاو لەدیمەنی بـەفربارین بکـەم کـە تازەدەسـتی پێکردبـوو و, بڕیـاری دابـوو هەمووشـتێك و ڕەنگێکـی سروشـت داپۆشـێت بەوبێدەنگیە ئاگادارکـەرەوە گـەورەیی یـەی : مـن هـاتووم خێروخۆشـیم بۆهێنـاون , بۆیـە هەرمنیش ئێستا شایستەی فەرمانڕەوایم : بەلام ئافرەتەکـە ڕێگـای پێـەدام و بـۆ خـۆی لای پەنجەرەکە دانیشت بێ ئەوەی یەك وشەش بلێت , بڕیارم دا تەماشای پێش خۆم بکەم و هیچ گرنگیەکی پێنەدەم , بەلام هەستم کردئەو ئاوڕی لێ دامەوە و سـەرنجی دەم وچـاوی دەدام, ئەم تەماشاکردنەی بەردەوام بوو بێ ئەوەی یـەك - وشـەش بلێـت , مـنیش هـەر تەماشـای بەردەمی خۆمم دەکرد , هەتاوام لێهات هەستم بـەبێ تاقـەتی دەکـرد لـە تەماشـاکردنەکەی کەئەم دەبینی بەلام هەستم پێ دەکرد , بۆیە ئاوڕم بەلای ئەودا کردەوە.

لەو کاتە ئافرەتەکە بەپێکەنینەوە وتی : دەم ویست توانای خۆڕاگری و ئارام گرتنت تاقی بکەمەوە.

ووتم : ئارام گرتن لەسەرچی ؟ ئافرەتەکە وتی : لەسەرکەم ڕەوشتی , دەزانم بیرت لەچی دەکردەوە. وتم : باوەڕناکەم بزانی , گرنگیش نی یەلام کەبی زانی.

ئافرەتەکە وتی : باشە دواترێت دەلـێم , بـەلام ئێـستا سـەرقالم کەچـۆن ئـەم قـەرزەت بۆبگێڕمەوە.

وتم :- کارەکە واگرنگ نی یە , خۆتی پێوە سەرقال مەکە.

ئافرەتەکە وتی : پێداویـستیەکم لایە دەی فرۆشم و قەرزەکەت دەدەمەوە کەیۆرۆیەکـە ئایـا لێم دەکری یان بەکەسێکی تری بفرۆشم ؟

ووتم : ئایا دەتەوێت لێت بکڕم پێش ئەوەی بزانم چی یە ؟

ئافرەتەکەووتی :- ئەوشتە (لێزانی یە) واتە (حکمـە)یـە , یـەك یـۆرۆم بدەیـە بـۆ ئـەوەی

(لێزانیەكەت) بدەمێ.

وتم : ئایا پۆرزۆیەكەم دەدەیەوە ئەگەرلێزانیەكەم بەدلْ نەبوو ؟

ئافرەتەكە وتی : نەخێر , چوونكە قسە كەكردت ناتوانی بیگێریتەوە , هەروەها پێویستم بەپۆرزۆیەكە بۆ ئەوەی قەرزەكەمی پێ بدەمەوە. پۆرزۆیەكم لە باخەلْم دەرهێنا و سەرنجی گۆرانكاریەكانی رۆخساریم دەدا , تاكو ئێستاش چاوەكانی جوانیەكانیان لەدەست نەداوە , وەكوئەوەی لەهەرەتی لاوی دابێت , لووتە باریكەكەی لەگەلْ چاوەكانی دا دەنگوباسی زەبرەكی ریویانەیت پێ دەلێن , روخساری وای پێوەدیارە كە ئافرەتێكی رۆشنبیرە , بەلام من هیچ پرسیارێكم لەوبارەوە لێ نەكردبوو , من گومانم لەوە دانەبوو كە باسی خۆیم بۆدەكات , سەفەرەكەمان تاكو ئێستا لە ناوەراست دابوو. بەوەرگرتنی پۆرزكە دەستی داخست , وەكو منداڵێكی بچووك دلْخۆش بوو بەوەرگرتنی پۆرزكە و وتی : من ئێستاخانەنشینم , پێشترمامۆستای فەلسەفەبووم , لەشارەكەی خۆم هاتم بۆئەوەی هاورێیەتی برادەرێكم بكەم بۆفرۆكەخانە , هەرچی پارەی لام بووخەرجم كرد, تەنها بەشی پێداویستی گەرانەوەم هێشتەوە بۆ شارەكەی خۆم, بەلام شۆفێری تەكسی زۆرنیگەرانی كردم پۆرزۆیەكی زیادی لێ وەرگرتم , بۆیە لەدلْی خۆمدا وتم چاوەروانی پاس دەكەم لە دەرەوەی وێستگە , ئەم زانی كە ئەمە قەدەغە یە , بۆیە ویستم بەشێوازێكی ترسوپاست بكەم دوای ئەو جوامێریەی لێم بینی , دوای ئەوەی پۆرزۆیەكت بۆدام بێ ئەوەی داوات لێبكەم , بابەتەكە مادە نی یە , ئەگەر پێم بلێیت پارەكە كەم بوو , بۆیەپێت دەلێم تۆدەست پێش خەریت كرد بۆ چاكەكردن بەبێ بیركردنەوە. بەزەردەخەنەوە قسەم پێ بری : دەزانم سەرگوزەشتەی ژیانی خۆتم بۆباس دەكەیت , بەلام كوانەو شتەی كەلەتۆم كری , لێزانی یەكەلەكوێ یە ؟

وتی : تەنها دەقیقەیەك خولەكێك.

وتم : باشەخولەكێك چاوەرێ دەكەم.

وتی : نانا , چاوەرێ مەكە((تەنهاخولەكێك))... ئەوەلێزانیەكەیە.

وتم : هیچ شتێك تێنەگەیشتم.

وتی : لەوانەیە واهەست بکەیت تۆش فیلّ وتەڵەکەبوویت ؟

وتم : لەوانەیە.

وتی : ئێستا بۆت شی دەکەمەوە : ((تەنهاخولەکێك)) ئەم وشەیە لەبیرنەکەیت. لەهەرکارێك ویستت بڕیاری لەسەربدەیت , کاتێك بیرت لێ کردەوەو , گەیشتیت بەچرکەساتی بڕیارلەسەردانی , خولەکێکی تر زیاتر بدەخۆت , تەنها شەست چرکە. ئایادەزانی مێشکت توانای وەرگرتنی چەند زانیاری هەیە بۆچارەسەرکردن لەماوەی شەست چرکەدا ؟ بەو تەنها خولەکە , کەبەخۆتی دەدەیت پێش ئەوەی هەست بەدەرکردنی بڕیارێك , لەوانەیە زۆرشت بگۆڕێت , بەڵام بە مەرجێك.

وتم : ئەومەرجەچی یە ؟

ووتی : هەرچی هەیە لە دەروونی خۆتی دەردەکەیت , هەروەها مێشك و دڵیشت بەتاڵ کەیتەوە لە هەرچی بنەمای مرۆڤایەتی و نموونەی ڕەوشتە بەیەك جار بۆیە چارەسەرێکی بابەتیانەو بێ لایەنداری بکەیت , بۆ نموونە : ئەگەربڕیارت دا کە تۆ خاوەن مافی و بەرانبەرەکەت ستەمی لێ کردوویت , لەماوەی ئەو خولەکەدا کاتێك دەروونی خۆت پاك کردەوە , لەوانەیە بۆت ڕوون بێتەوە لایەنی بەرانبەریش مافی هەیە , یان بەشێك لەڕاستی لایە , لەو کاتەدا بڕیارەکەت دەگۆڕێت بەرامبەری. یان ئەگەرویستت کەسێك سزابدەیت , لەماوەی ئەوخولەکەدا لەوانەیە بیانوێك بێنیتەوە و سزاکەی سوك بکەیت یان سزای نەدەیت یان لێی خۆش بیت بەیەکجاری. تەنها یەك خولەك وات لێدەکات دادگەربیت لە هەنگاونان بەرەو بڕیاردانی چارەنووساز لە ژیانتدا , لە کاتێکدا وات زانیبوو کە هەنگاوێکی دروستە , بەڵام لەوانە بوو کارەسات باربێت , تەنها خولەکێك وات لێدەکات زیاتر پابەندبیت بەلایەنی مرۆڤایەتیت و دوور بکەویتەوە لە ئارەزوو , تەنهاخولەکێك لەوانەیە ڕێڕەوی ژیانت و ژیانی خەڵکی تریش بگۆڕێت , ئەگەر یەکێك بیت لەکاربەدەستانیش ڕێڕەوی سەراپای ژیانی میللەتێك دەگۆڕێت ئایادەزانی ئەوشتانەی دەربارەی خولەکێك بۆم شی کردیتەوە تەنهایەك خولەکێکی خایاند ؟

ووتم : ڕاست دەکەیت , منیش ئەوالێم وەرگرتیت ئەم کڕین وفرۆشتنە یەك یۆرۆکەت پێ حەڵاڵ بێت ؟ ئەم زانی کات ئاوا بە خێرایی تێدەپەڕێت. ئەم گەشتەم لەسەرجەم گەشتەکانی ترم خۆشتربوو , هەتا زۆرهەستم بەدڵ تەنگی کـرد کاتێـك لـەنیوەی ڕێگـادا بەشـارەکەیان گەیشتین و بەجێی هێشتم. چارەگێك پێش ئەوەی بگەینە شارەکەیان , ویستی بەمۆبایلەکـەی پەیوەندی بەکوڕەکەیەوە بکات بۆ ئەوەی بێتە وێستگە وبیگەێنێتەوە ماڵ , بەڵام ڕووی بەڵای منداکردەوەو،

ووتی : وابزانم مۆبایلەکەم کـارتی تێدانـەماوە. بۆیـە مۆبایلەکـەی خـۆم دایـە بـۆ ئـەوەی پەیوەندی بە کوڕەکە یەوە بکات , بەڵام ئەوەی چاوەڕوان نەکرابوولەناکا و پـاش ڕۆیـشتنی بەیەك چارەگ دوونامەم بە مۆبایلەکەی بۆهات , نامەی یەکـەم نووسـرا بـوو ئـەم ژمارەیـە کارتێکی بەدەیۆرۆ ناردۆتە سەرحسابەکەت , نامەی دووەم نووسرابوو : مۆبایلەکەم کـارتی تێدامابوو بەڵام فێڵم لێ کردی بۆ ئەوەی ژمارەی مۆبایلەکەت بزانم بۆ ئەوەی پاداشـتی ئـەو چـاکە وکـردەوە باشـەت بدەمـەوە ئەگەرحـەزت کـرد ژمـارەی مۆبایلەکـەم بپـارێزە , ئەگەرسەرداني شارەکەشمت کرد وابزانەدایکێك لەوێ پێشوازیت لێدەکات , بەنامەیەك ئاوا وەڵامم دایەوە :- کاتێك لەسەرەتادا تەماشای چاوەکانتم کـرد , وام هەسـت کـرد ئەوانـە چاوانێکی ڕێوی ئاسان ، بەڵام ئەم توانی ئەمەت پێ بڵێم , بەڵام ئێستا هیوادارم جـارێکی تـر ڕۆژگا ربەیەکمان شـادبکاتەوە , زۆرسوپاسـی ئەولێزانیـەت دەکـەم و , بـاش بزانـە کـەمن زۆرگرانترلەو پارەیە دەی فرۆشم.

تەنهاخولـەکێك... لێزانیە،کـە خـستوتمە ڕوو بـۆ فرۆشـتن , ئایـا کـێ لـێم دەکڕێـت لەسەردەمێکدا کە چەندان و چەندان سەعات لەکات بەفیڕۆدە چێت ؟

# سەرگوزەشتەی ((مشك)) گۆڕا بۆ ((پڵنگ))



ولاّتێك کە ڕووبەرەکەی تەنها ٣٢٠ هەزار کیلۆمەتری چوارگۆشەیە ژمارەی دانیشتوانەکەی ٢٧ میلیۆن کەسە، یان سێ یەکی دانیشتوانی میسرە تاك و ساڵی ١٩٨١ لەدارستانەکان دەژیان، و سەرقاڵی کشتوکاڵی لاستێك و مۆز ز ئەناناس و ڕاوی ماسی بوون... بڕی داهاتی مام ناوەندی تاکێك ساڵانە لەهەزار دۆلار کەمتر بووە..

وەململانێی ئاینەکان ((١٨)) ئاین فەرمانڕەوایە..

تا ئەو کاتەی خوای گەورەو بەتوانا پیاوێکی بۆ ناردن بەناوی ( Mohadir bin mohamat) هەروەکو لەتۆمارەکانی مالیزی دا نووسراوە! یاخود ((مەهاتیر محەمەد)) وەکو ئێمە ناوی دەبەین.. ئەوبرابچوکی نۆبرابوو.. باوکیان مامۆستای سەرەتایی بوو مووچەکەی ئەوەندە نەبوو خەونی ((مهاتیر))ی کوڕی بهێنێتەدی بۆکڕینی ئوتومبێلێك کەپێی بچێت بۆ قوتابخانەی ئامادەیی.. بۆیە ((مهاتیر)) لەسەر شەقامەکان کاری (مۆز) فرۆشتن دەکات تاوەکو خەونەکەی بێنێتەدی و چووە کۆلیژی پزیشکی لەسەنگافورەی دراوسێ.. ئینجادەبێتە سەرۆکی یەکێتی قوتابیانی موسڵمان، لەساڵی ١٩٥٣ لەزانکۆ بەرلەوەی دەربچێ.. پاشان وەکو پزیشك کاردەکات لەحکومەتی ئینگلیزی داگیرکاری ولاتەکەی تاوەکو ساڵی ١٩٥٧ کە (مالیزیا) سەربەخۆیی وەرگرت, عیادەیەکی تایبەتی کردەوە بۆ نەشتەرگەر وە نیوەی کاتەکەی بۆپشکینی بێ بەرامبەری هەژاران تەرخان کرد.. لەساڵی

١٩٦٤ مافی ئەندامیـەتی ئەنجومـەنی گـەلی بەدەسـت هێنـا, بـەلام دوای ٥ سـاڵ ئەنـدامێتی ئەنجومەنی لەدەست دا, ئینجـا سـەرگەرمی دانـانی کتێبێـك دەبێـت دەربـارەی ((دوارۆژی ئابوری مالیزیا)) لەساڵی ١٩٧٠.. پاشان جارێکی تر وەکو (پەرلەمانتار) هەڵدەبژێردرێتەوە ساڵی ١٩٧٤.. لەساڵی ١٩٧٥ بە وەزیری فێرکـردن دەسـت نیـشان دەکـرێ, لەپاشـان دەبێتە یاریدەدەری سەرۆك وەزیـران لەسـاڵی ١٩٧٨, ولەسـاڵی ١٩٨١ پۆسـتی سـەرۆك وەزیر وەردەگرێ, دووبارە دەڵێم لەساڵی ١٩٨١, سەرەتای سەرهەڵدانی سەرتاسەری بـوو کەدەربارەی لەوتەیەکیدا لەکتێبخانەی ئەسکەندەریە گوتی سوودی لەبیرۆکەی سەرهەڵدانی میسری وەرگرتووە کەلەسەردەستی محمد علی ئەنجام درا :

ئاخۆ ((پزیشکی نەشتەرگەر)) چی کردووە ؟

یەکـەم : ئەخـشەی دوارۆژی (مالیزیـا)ی کێـشاو تیایـدا کـارە سـەرەکیەکان وئامـانج و دەرئەنجامەکانی دیاری کرد, کە پێویستە لە ماوەی دە ساڵ بێ ی بگەن.. وەپاش ٢٠ سـاڵ. تاکوساڵی ٢٠٢٠

دووەم : بڕیاری دا فێرکردن وتوێژینەوەی زانستی لەکارە پێـشینەکان ولەسـەرووی کـارە گرنگەکانی بێت , دواتربەشی زۆری بودجـەی ولاتـی تـەرخان کـرد بۆئـەوەی لەمەشـق و ڕاهێنــان وپیــشەگەران خــەرج بکرێــت.. هــەروەها لەپــەروەردەوفێرکردن.. ونەهێـشتنی نەخوێندەواری.. و فێرکردنی ئینگلیـزی.. و لەلێکۆڵینەوە زانستیەکان.. هـەروەها بـەدەیان هەزارکەسی ناردە باشترین زانکۆیانی یەکان بۆخوێندن.. بۆچی بایەخ بەسوپا بدرێ کەئەوان لەحاڵەتی جەنگ یان هەڕەشە لێکردن دابن ؟

بۆچی زیادەڕەوی بکرێ لەبنیات نانی کۆشك وتـەلارەکانی حکومـەت وکەشـخە لێـدان وخۆشحاڵی دەربڕین وپرسەودەستەوایی ودیاری کرین.. لەکاتێك دا کـەماڵ پێویـستی یـەتی لەمزگەوت حەرامە ؟

سێ هـەم : زۆربـە ڕاشـکاوی وروونـی پـلان وسـتراتیژیەتەکەی بۆگـەل ئاشـکراکرد , و لەسیستمی لێپرسینەوە ئاگاداری کردنـەوە , کەبـەبێ ی پاداشـت و سـزا بـەڕێوە دەچێـت

بۆگەیشتن بە ((سەرهەڵدانی گشتگیر)). خەڵك باوەڕیان پێ كـردو لـەدوای ڕۆیـشتن و بـە ((كەرتی كشتوكاڵ)) دەستیان پێ كرد.. یەك ملیۆن نەمامی ((دارخورمابۆرۆن)) یـان چـاند لەدووساڵی یەكەم دا , مالیزیـا بـوو بەیەكـەمین وڵاتـانی جیهـان لەبەرهـەم هێنـان وناردنـە دەرەوەی ((ڕۆنـی دارخورمـا)) هەروەهالـە ((گەشـت وگـوزار)) : بڕیـاری دا ئامانجمـان لەدەساڵی داهاتوودا ۲۰ ملیاردۆلاربێـت لـەجیاتی ۹۰۰ ملیـۆن دۆلاری سـاڵی ۱۹۸۱, تاكوئێـستا گەیشتۆتە ۳۳ ملیـاردۆلار لەسـاڵێكدا.. ئـەوەش ڕووی دا . سـەربازگە ژاپـۆنی یەكانی كردبە ناوچەی گەشت وگوزاری كەلـەڕۆژانی شـەڕی دووەمـی جیهـانی دا بنیـات نرابورن وهەموو جۆرە چالاكیەكی كـات بەسـەربردنی تێدائـەنجام دەدرا , هـەروەها شـاری وەرزشـی , و سـەنتەری هونـەری ورۆشـنبیری دامـەزران.. بـەم شـێوەیە مالیزیـا بووبـە ((سەنتەرێكی جیهانی)) بۆپێشبڕكێ ی نێودەوڵەتی ئۆتومبێل و ئەسپ سواری, و یاریـەكانی ناوئاو , و چارەسەری سروشـتی , و..... و..... لەكـەرتی ((پیـشەسازی )) دا لەسـاڵی ۹٦ پێشكەوتنێكی مەزنی بەدەست هێنا گەیشتە ٤٦ لەچاوساڵی پێشتر ئەوەش بەهۆی سیـستمی گشتگیرو سەركەوتنی گەورە لەئامێرە كارەبـایی یـەكان , و بژمێروكۆمپیوتـەرە ئـەلیكترۆنی یەكان. لـەبواری چـالاكی دارایـی: دەرگـای خـستەسەرپـشت بەكۆمـەڵێك مـەرجی ڕوون لەبەردەم وەبەرهێنەرانی ناوخۆیی وبیـانی بۆدروسـت كردنـی بـەرزترین دووتـاوەری جـك لـەجیهان دا كـە ٦٥ سـەنتەری بازرگـانی بەتەنهالـە ((كـوالا لامپـور)) ی پایتـەخت لەخۆدەگرێ.. هەروەهابۆرسەی دامەزراندكە قەبارەی مامەڵەكردنەكانی ڕۆژانەی گەیـشتۆتە دووهەزارملیۆن دۆلار , (لەمیـر ٤٠٠ ملیۆنە). هەروەهامەزنترین زانكۆی ئیسلامی لەسـەر ڕووی زەوی دامەزرانـد , كەیەكێكەلـە لـەگرینگترین ٥٠٠ زانكۆكـانی جیهـان و لەبەردەمیداگەنجەكانی كەنداوبەڕیز دەوەستن , هەروەها پایتەختی كارگێڕی تازەی دامەزراند putrajayaبەتەنیشت پایتەختی بازرگانی ((كوالا لامپور)) كەئێستاكە لـە۲ملیـۆن كـەس كەمترتیایـدادەژین , بـەڵام نەخـشەیان دارشـتووە بۆسـاڵی ۲۰۲۰ حـەوت ملیـۆن كـەس تیایدابـژی , هەربۆیـە دوو فرۆكەخانـە و دەیـان ڕێگاوبـانی تیـژڕەویان دروسـت كـرد

بۆئاسانکاری گەشتیاران , و هاولاتیان , و وەبەرهێنەران , کەلەچینەوە هاتوون , هەروەها لەهیندستان و ولاتانی کەنداوو هەموو ناوچەیەکی سەرزەویەوە هاتوون , هەزاران میوانخانە وئوتێلا دروست دەکەن هەرلەپێنج ئەستێرەوە تادەگاتە مۆتێل شەوی بەبیست دۆلار

بەکورتی وپوختی :

حاجی مەهاتیر توانی لەساڵی ١٩٨١ تا ٢٠٠٣ ولاتەکەی لەخواری خوارەوە بەرزبکاتەوە بۆلوتکەی ولاتە پێشکەوتووەکان , کەبەپەنجەی دەست ئاماژەیان بۆدەکرێت , دوای ئەوەی داهاتی تاکەکەسی لە١٠٠ دۆلاری ساڵانە لەساڵی ١٩٨١ کەفەرمانڕەوایی ولاتی گرتەدەست گەیاندە ١٦ هەزار دۆلار لەساڵێکدا.. هەروەها پارەی یەدەگی ولاتەکەی لە٣ ملیارەوە گەیشتۆتە ٩٨ ملیار ((لەمیسر ٣٤ ملیارە)). هەروەها قەبارەی هەناردەکانی گەیشتۆتە ٢٠٠ ملیار دۆلار , ئەوشکستی نەهێنا کاتێك فەرمانڕەوایی ولاتی گرتەدەست لەولاتێك کە ١٨ ئاینی جیای تیایە , هەروەها لەگەلەکەی دانەبڕا کاتێك چووە سەرکورسی دەسەلات لەساڵی ١٩٨١ ژمارەیان ١٤ ملیۆن بوو ئێستاکە بوونەتە ٢٨ ملیۆن , ودەستی بەکورسیە کەیەوە بەند نەکردووە تاکو دواهەناسەی ژیانی یان نیازی بێ بۆمیراتگرانی بەجێ بهێڵێ.

لەساڵی ٢٠٠٣ و دوای ٢١ ساڵ , بڕیاری دا بەتاکەویستی خۆی وشتەکە بەبارەکەیەوە بەجێ بهێڵێ , سەرەڕای ئەوهەموو بانگەوازانە , بۆئەوەی پشووبدات و ((نەخشە)) و((پلانی کار)) بۆکەسی دوای خۆی بەجێ بهێڵێ کەناوی ((بیست.. بیست))ە.. یان شێوەی مالیزیا لەساڵی ٢٠٢٠ , کە دەبێتە چوارەم هێزی ئابوری لەکیشوەری ئاسیا دوای چین و ژاپۆن وهیند. هەربۆیەش لەمێژوودا دەنوسرێت : ((ئەو موسڵمانە عەلمانیە))ی ئیسرائیل نەی تۆقاند کاتێك دانیان پێدانەنا تاکو ئەمڕۆش , هەروەها بەردەوام ڕەخنەی لەسیستمی جیهانگەرایی ڕۆژئاوا بەشێوەی ئێستای دەگرت کە ستەم لەولاتە تازەگەشەسەندوەکان دەکات , هەروەها چاوەڕوانی کۆمەك و یارمەتی ئەمریکی یان ئەورروپی نەدەکرد , بەلکوپشتی بەخوابەستبوو , ئینجا بەویست وئیرادەی خۆی و ڕاستگۆیی وبوێری وپشت ئەستور بوون بەهێزوتوانای

گەلەکەی وزیری ڕۆڵەکانی تاوەکو توانی ولاتەکەی لەسەر ((نەخشەی جیهانی)) دابنێت , خەڵکان ڕێزی لێ بگرن , وکلاوی ڕێزی بۆدابگرن بەم شێوەیە ((نوژداری نەشتەرگەر)) بەشارەزایی و پسپۆڕی خۆی سەرکەوت , سەرەڕای خۆشەویستی ڕاستەقینەی بۆولاتەکەی , توانی مالیزیا بگەیەنێتە لوتکە کەپێشتر ((مشك)) ێك بوو , بوبە ((پڵنگ))ێکی ئاسیایی هەزارویەك حسابی بۆدەکرێت بەلام ((نەشتەرگەران))ی لای خۆمان , و لەزۆربەی ولاتە عەرەبیەکان , وەکو ((سەرتاشی لادێ)) وان کەپیشەی پزیشکی بەدرۆوبوختان ئەنجام دەدەن.. دەبینی , ئەگەربە ((نەزانی)) و ((سەرکەشی)) و ((گێژی)) خۆیانەوە بتوانن ((شێرێك)) بگۆڕن وبیکەن بە ((مێرووله)) پاك وبێگەردی بۆئەوخوایەی هەموجۆرە کەسێکی دروست کردووە!

بەپێنوسی / د.محمود عمارە

## کەمانچە ژەن



چیرۆکی کەمان ژەنە فەرەنسیەکە، کە دەبوو نمایشی کەمان ژەنین بکات لەبەردەم لیژنەیەکی حەوت کەسی لە کەمان ژەنە ناودارەکان... بۆیە نمایشەکەی هۆکاری دیاری کردنی داهاتووی پیشەیی بوو بۆی بێ ئەوەی هیچ هەلێك هەبێت بۆ دووبارە کردنەوەی.

کاتێك دەستی کرد بە کەمان ژەنین یەکێك لە تاڵەکانی کەمانەکەی پچڕا ، بەڵام ئەو بەهەمان ئاستی ژەنینەکە بەردەوام بوو بێ پچڕان، بەڵام هەر زوو تاڵێکی تریشی پچڕا دواتر سێیەم تاڵیشی پچڕا تاکو تەنها تاڵی چوارەم مایەوە بەڵام ئەو هەر بەردەوام بوو لەسەر ژەنینەکەی تاکو پارچە ئاوازە دیاری کراوەکەی بە کۆتا گەیاند.

لیژنەکە نمرەی تەواویان پێدا !!! ئەمەش لەبەر جوان ژەنینەکەی نە بوو بەتەنها بەڵکو بەهۆی ئازایەتی و بوێری و بەردەوامی و پاش گەز نە بوونەوەی بوو؟؟

ناوەرۆکی چیرۆکەکە.بەردەوام بوون بەبێ وەستان هەرچەندە تاڵەکانت بپچڕێن لەکاتە ناخۆشەکاندا دەت گەیەنن بە ئامانج......

# ئاوی بیرەکە و زیرەکی قازی



بازرگانێك بیرێکی بەیەکێك لە جوتیارەکان فرۆشت و پارەکەی بەتەواوی لێ وەرگرت. کاتێك جوتیارەکە هات بۆ ئەوەی کشتوکاڵەکەی بەئاوی بیرەکە ئاو بدات. بازرگانەکە نەی هێشت و پیێ ووت: من بیرەکەم بە تۆ فرۆشتوە نەك ئاوەکەی، بۆیە پێویستە پارەی ئاوەکەشم بدەیتێ بۆ ئەوەی کشتوکاڵەکەت ئاو بدەیت و ببێتە موڵکی تۆ ؟ جوتیارەکە زۆر بەم قسەیە نیگەران بوو بۆیە چوو بۆلای قازی. قازیش بانگی جووتیارەکەو بازرگانەکەی کرد و گوێی بۆ ووتەکانیان شل کرد. پاش گوێ گرتن لە ووتەکانانیان قازی بە بازرگانەکەی ووت: ئەگەر تۆ بەڕاستی تەنها بیرەکەت بە بێ ئاو بە جوتیارەکە فرۆشتوە پێویستە هەرئێستا ئاوەکەی خۆت لەبیری جوتیارەکە بەتاڵ بکەیت یاخود بیرەکەی لێ بەکرێ بگریت و پارەی بدەیتێ بۆ ئەوەی کە ئاوەکەت بۆ هەڵ بگرێت ؟؟ بۆیە بازرگانەکە زانی کە پلانەکەی سەرکەوتوو نە بو بە سەر شۆڕی و تێکشکاوی دادگای بە جێهێشت.

# پیاوە هەژارەکە



رۆژێك پیاوێکی دەوڵەمەند سەبەتەیەکی پڕ لە خۆراکی خراپ و بەسەرچووی دایە پیاوێکی هەژار.....

پیاوە هەژارەکە زەردە خەنەیەکی کرد و سەبەتەکەی هەڵگرت و کۆشکی دەولەمەندەکەی بە جێهێشت.........

هەژارەکە دەستی کرد بە پاکردنەوەی سەبەتەکە لە خۆراکە بەسەرچوو و خراپ بووەکە.

بۆیە دەستی کرد بە چنینی جوانترین و رازاوەترین گوڵ و سەبەتەکەی لێ پڕ کرد و گەڕایەوە بەرەو کۆشکی پیاوە دەوڵەمەندەکە و سەبەتەکەی پێشکەش کرد؟؟

بۆیە پیاوە دەوڵەمەندەکە سەری سوڕما لەکاری هەژارەکەو پرسیاری لێ کرد ؟؟!!!!

بۆچی من سەبەتەیەك لە خۆراکی خراپ و بەسەرچووم دا بەتۆ.....بەڵام تۆ سەبەتەیەکت لە جوانترین و ڕازاوەترین گوڵ بۆ من هێنا....؟؟؟

پیاوە هەژارەکە وەڵامی دایەوە..!! هەموو مرۆڤێك چی لە ناو دڵی دایە ئەوە دەبەخشێت....؟؟؟؟!!!

# بیردۆزی ٥٠٠ دۆلاری



مامۆستایەك لەیەكێك لەوانەكانیدا ٥٠٠ دۆلاری لەباخەڵی دەركرد و بە قوتابیەكانی ووت: كێ ئەو ٥٠٠ دۆلاریەی دەوێت زۆر بەی قوتابیەكان دەستیان بەرز كردەوە. بۆیە پێی ووتن : باشە دەتان دەمێ بەڵام پاش ئەوەی ئاوای لێدەكەم هەڵسا بە لوول كردنی ٥٠٠ دۆلارەكە و ووتی : كێ ئێستا دەیەوێت. قوتابیەكان تاكوئێستاش هەر دەستیان بەرز دەكردەوە. پاشان هەڵسا كردی بە ژێر پێڵاوەكانیدا. بۆ جاری سێیەم زۆر بەی زۆری قوتابیەكان دەستیان بەرز كردەوە

پاشان مامۆستاكەیان پێی ووتن : پێویستە ئێستا وانەیەكی گرنگ فێربین، هەر شتێكم بە پارەكە كرد تاكو ئێستا زۆربەتان هەر دەتانەوێت لەبەر ئەوەی هیچ لە بەهای ٥٠٠ دۆلارەكەی كەم نەبۆتەوە.

ئیمە زۆر بەی جار دەكەوینە سەر زەوی خۆمان لوول دەكەین و دەگەڕێینەوە بە هۆی ئەو بڕیارانەی دەیدەین.... یان بە هۆی ئەو بارو دۆخەی چوار دەوریداوین.. بۆیە هەرشتێكت بەسەر بێت بە هاكەت لە دەست نادەیت لەبەر ئەوەی تۆ كەسێكی نمونەیی... پێوویستە هەمیشە ئەوەت لەیادبێت....؟؟؟

# ئافرەتە جوانەکە....؟؟



لە سەر کورسی باخچەی گشتی دانیشتبوو، چاووی بە دوور و نزیکی خۆیدا دە گێڕا و چاو دێری خەڵکی دەکرد کە چی دەکەن و خەریکی چین، هەندێکیان یاری دەکەن و، هەندێکیان دە خوێنەوەو، هەندێکیشیان خەریکی بیرکردنەوەن.......

هەستی بە بێزاریەکی زۆر کرد کاتێك لە دوورەوە ئافرەتێکی بالآبەرزی شۆخ و شەنگی جوانی بینی....؟؟ بەڵام لەبەر دووری هێشتا دیمەنی ڕووخساری دیار نەبوو...

بەڵام باڵای زۆر جوان دیار بوو،بۆیە بە خێرانە بێزارکەرەکەی کە لەبەسەرباز دەچێت...بۆیە چاودێری ڕۆیشتنەکەی دەکرد کە بەرەوو ڕووی دەهات. کاتێك بینی منداڵێك لە تەنشتیەوە دەڕوات... بە دڵ تەنگیەوە ووتی: پیرۆز بێت لە هاوسەرەکەی ئەو شۆخ و شەنگی و جوانیە ؟؟ کە ئاوا بە جوانی هەڵس و کەوت لەگەڵ منداڵەکەیدا دەکات.

وای......چەندە شەرمەزاربوو کاتێك ئافرەتەکە لێی نزیك بووە وە بینی ئەوە خێزان و منداڵەکەی خۆیەتی..!!

کاتێك شتانێك کەهی خۆمان نین زۆر جوانتر دێنە بەرچاومان،بەڵام کاتێك خەیاڵت بە شێوازێکی ئەرێنی خستە کار ئەو جوانیانە دەبینین کە هەمانە.................

# خۆشەویستی ڕاستەقینە



ژن و مێردێك بەیەکەوە سەردانی باخچەی ئاژەڵانیان کرد، لەناو قەفەزی مەیمەنەکاندا دوو مەیمونی نێرو مێ یان بینی کەبەیەکەوە یارییان دەکرد، ژنەکە ووتی : بەڕاستی نمونەی چیرۆکێکی زۆر جوانن.

بەڵام کاتێك بەرەو قەفەزی شێرەکان ڕۆیشتن بینیان دوو شێری نێرو مێ کەمێك دور لەیەکتری پاڵ کەوتوون بە بێ دەنگی، ژنەکە ووتی : بەڕاستی نمونەی چیرۆکێکی خۆشەویستی زۆر ناخۆشن !

پیاوەکە بە خێزانەکەی ووت : ئەو شوشە بەتاڵە هەڵبدە بۆناو قەفەزی شێرەکان بزانە چی ڕوودەدات ؟ کاتێك ژنە کە شوشە بەتاڵەکەی بۆلای مێیە شێرەکە هەڵدا... نێرە شێرەکە ڕای کرد بۆلای مێیەکەی بۆ ئەوەی پارێزگاری لێ بکات لەهەر شتێکی نەخوازراودا !

بەڵام کاتێك شوشەیەکی بەتاڵی فڕێدا بۆ ناو قەفەزی مەیمونەکان، نێرە مەیمونەکە ڕای کرد بۆ سەر شوێنێکی بەرزوو مێیەکەی جێهێشت بۆ ئەوەی خۆی هیچی بەسەر نەیەت..! !

پیاوەکە بەژنەکەی ووت : بەڕواڵەتی دەرەوەی خەڵکی باوەڕ مەکە، خەڵکانێك هەن دەت خەڵەتێنن بە هەستو سۆزە درۆینەکانیان، هەشیانە پارێزگاری لە هەستو سۆزیان دەکەن بە خۆشەویستیەکی شاراوە.

# زۆرداری



ڕۆژێکیـان گوێدرێـژێك چـوو بـۆلای شـێرێك، کەنیـشانەی هەڵـچوون و تـوڕەیی بـە ڕوخـساریەوە دیار بوو، پرسیاری لە شێرەکە کرد بەڕاستی تۆ گەورەی دارستانی ؟ شـێرەکە وەڵامی دایەوە : بەڵێ، بەڵام چی ڕوویداوە ؟

گوێدرێژەکە ووتی : هەموو ڕۆژێك کە پڵـنگ دەم بینێ لە دەمووچاوم دەدات و پرسـیارم لێ دەکات بۆچی کڵاوت لەسەر نـەکردووە ؟ بۆیـە مـن دەمـەوێت بۆچـی لـێم دەدات و مەبەستی چ کڵاوێکە لەسـەری بکەم؟

شێرەکە وەڵامی دایەوە : ئەو کارە بۆمن واز لێ بێنە.

کاتێك شێرو پڵێنگەکە بە یەك گەیشتن،پرسیاری لە پڵنگەکە کرد کە ئەو مەسەلەی کڵاوە چیە ؟

پڵێنگەکە وەڵامی دایەوە: تەنها بیانویەکە بۆ ئەوەی لێی بدەم....

شێرەکە ووتی : لە هۆکارێکی ڕوونتر بگەڕێ، بۆ نمونە داوای لێ بکە سێوت بـۆ بێنێـت، کاتێك سێوێکی زەردی بۆ هێنای پێی بڵێ بۆ چی سێوە سورەکەت نەهێناوە ؟

کاتێك سێوە سورەکەی بۆ هێنای پێی بڵێ بۆ چی سێوە زەردەکەت نەهێنا وە ؟

پڵنگەکە لە وەڵامدا ووتی : بیرۆکەیەکی جوانە....

ڕۆژی دواتر کاتێك پڵنگەکە گوێدرێژەکەی بینی داوای لێکرد سێوێکی بۆ بهێنێت.
گوێدرێژەکە پرسیاری لێ کرد سێوی سورت دەوێت یان سێوی زەرد ؟
لەو کاتەدا پڵنگەکە زمانی کەوتە تەتەڵەکردن و پێی ووت : سێوی زەرد یان سور ؟
دواتر لە گوێدرێژەکەی داو پێی ووت : بۆ چی کڵاوەکەت لەسەر نەناوە ؟
زۆردار پێویستی بە هیچ هۆکارێك نیە بۆ ئەوەی زوڵم بکات.

# جوتیارە چاو چنۆکەکە



جوتیارێکی چاو چنۆك هەبوو پارەو ماڵی زۆر خۆشدەویست، کاتێـك لـەوەرزی بـەهاردا باران دەباری دەپاڕایەوە دەی ووت : خودایە ئەگەر کەش خۆش بێت و خۆر بەدەرەوە بێـت و ئەوا دەست دەکەم بە گەنم چاندن.

لە ڕۆژی دواتر دا کە کەش خۆش بوو خۆر بەدەر کەوت دەستی کرد بە چاندنی گەنم بـە ڕێژەیەکی زۆر.

دواتر ووتی : خودا یە ئەگەر باران ببارێت ئەوا گەنمەکەم سودێکی زۆری دەبێت.

ڕۆژی دواتر ئاسمان بارانێکی زۆری باراند.

دواتر ووتی : خودایە ئەگەر بـارانێکی زیـاتر ببارێـت بـۆ جـارێکی تـر ئـەوا گەنمـە کـەم بەشێوەیەکی باشتر گەشەدەکات.

ڕۆژی دواتر جارێکی تر بارانێکی زیاتر باری.

دوای هاتنی وەرزی هاوین و کۆکردنەوەی بەرو بوومەکەی، هەستا بە داکردنی گەنمەکەی لە فەردەی گەورە.

ووتی : ئاخ خودایە بۆ چی بارانی زۆرترت بۆ نەدەباراندم بۆ ئەوەی ئێستا ڕێژەیەکی زیاترم لە گەنم دەست بکەوتبایە.

دواتر خودا نزاکەی قبولکردوو ئاسمان بارانێکی بە لێزمـەی دابارانـدو... !؟ گەنمەکـەی ژێرئاو کەوت و هەمووی خراپ بوو لە ناو چوو.

# هەڵخەڵەتاندن بە ڕووكەش



دەگێڕنەوە ڕاوچیەك كۆمەڵێك چۆلەكەی ڕاو كردبوو لە ڕۆژێكی زۆر ساردا، لەبەردەمی خۆی دایناببوون، یەكەیەكە سەری دەبڕین، چۆلەكەكانی تریش تەمەشای ڕاوچیەكەیان دەكرد، كە فرمێسك بە چاوەكانیدا دەهاتنە خوارەوە بەهۆی سەرماو سۆڵی زۆر و بە هێز، چۆلەكان تەماشای ڕاوچیە سەربڕەكەو فرمێسكەكانیان دەكرد، یەكێك لە چۆلەكەكان ووتی : تەماشای ئەو ڕاوچیە بەسەزمانە بكەن، چۆن دڵتەنگە بە هۆی سەربڕینی ئێمە، تەماشای كەن دەگریت بە هۆی سۆزو بەزەیی بۆ ئێمە ! چۆلەكەكەی تر بە بیركردنەوە و زیرەكی یەوە ووتی : تەماشای فرمێسكەكانی چاوەكانی مەكە بەڵكو تەماشای كاری دەستەكانی بكە كە چیمان پێ دەكات...؟!

# ئافرەتە قەڵەوەکە



ئافرەتێکی قەڵەو سواری پاس بوو
یەکێك لە سەرنشینەکان بە توانجەوە ووتی : نەم زانی بوو ئەم پاسە تایبەتە بە فیل...!
ئافرەتە بە هێواشی وەڵامی دایەوەو ووتی نا بە ڕێزم ئەم پاسە وەك کەشتی نوح وایە !
فیل و گوێدرێژیشی سەردەکەوێت ؟!

# ئەگەر هاوسەری من بوایە



ئافرەتێکی زۆر ناشیرن بە پیاوێکی ووت : ئەگەر هاوسەری من بوای ئەوا ژەهرم بۆ لە قاوە دەکردی ؟

پیاوەکە ووتی : ئەگەر هاوسەری من بوای ئەوا بێ دوودڵی یەك خولەك نەدەوەستام لە خواردنەوەی قاوەکە !!

# وام زانی پیاوی



پیاوێك ویستی موتەنەبی وەگیربێنێت...

بۆیە پێی ووت كاتێك تۆم لە دوورەوە بینی وام زانی ئافرەتی !؟

موتەنەبی لە وەڵامدا ووتی : بەڵام من كاتێك كە تۆم لە دورەوە بینی وام زانی پیاوی !.

# پیاوە کوێرەکە



پیاوێکی کوێر ژنی هێنا، ژنەکە ووتی : ئەگەر سپیەتی و جوانی منت دەبینی سەرت سوڕ دەما !!

پیاوە کوێرەکە ووتی : ئەگەر وەکو ئەوەی دەیڵێیت وابیت !!

ئەوا چاو ساغەکان نەیان دەهێشت بۆ من بیت.

# لـە خۆ بایی بوون



نووسەری بەناوبانگی جیهانی ( بەرنادشۆ ) کاتێك نووسەرێکی لە خۆبایی پێـی ووت: مـن لە تۆ بە تواناتر و باشترم، تۆ بۆ گەڕان و بەدەستهێنانی سەروەت و سامان دەنووسی ! بـەڵام من بۆ گەڕان و بەدەستهێنانی ئابڕو دەنووسم...!

بەڕنادشۆ یەکسـەر وەڵامی دایەوە و ووتی :ڕاسـت دەکـەی !! هەریـەك لـە ئێمـە بـەدوای ئەوشتەدا دەگەڕێت کە نیەتی..؟؟!!

# بەشاری کوڕی بوردە




کاتێك پیاوێکی خوێن تاڵ بە بە شاری کوڕی بووردەی ووت: خودا چاوی لە هەرکەسێك سەندبێتەوە  بە شتێکی باشتر قەرەبووی بۆ کردۆتەوە، ئەی خودا بەچی قەرە بووی تۆی کردۆتەوە؟

بەشار وەڵامی دایەوەو ووتی: بەوە قەرەبووی کردۆتەوە کە ناتوانم هاوشێوەی وەکو تۆ ببینم!!

# پەنهانزانی



پیاوێك هات بۆلای شێخ ئەلبانی کـە پڕوپاگەنـدەی ئـەوەی دەکـرد کـە زانـستی پـەنهان دەزانیت و داوای گفتوگۆی لێ کرد.

شێخ ئەلبانی ووتی :من مەرجێکم هەیە.

پیاوەکە ووتی: مەرجەکەت چیە؟

شێخ ئەلبانی ووتی: تۆ چۆن پەنهان دەزانی کە مەرجەکەی من نەزانی !!

# هاوڕێ ی بەوەفا



کوڕێکی لاو دوچاری نەخۆشی شێرپەنجە دەبێت ماوەی چەند هەفتەیەك لــە نەخۆشــخانە دەمێنێتەوە چارەسەری تیشکی و کیمیاوی بۆ ئەنجام دەدرێ، بــەم هۆیــەوە تــەواوی تــووکی سەری دەوەرێت. لە ڕێگەی گەڕانەوەی لە نەخۆشخانەوە بۆ ماڵــەوە هەســتی بــە نیگــەرانی دەکرد، نەك لەبەر نەخۆشیەکەی بەڵکو لەبەر شەرمەزاری یەك هەستی پــێ دەکــات کاتێــك بەسەری ڕووتاوەوە دەچێ بۆ قوتابخانە. ئەوەبوو بڕیاری دا کڵاوێــك یــان پرچــی دەســتکرد لەسەری بکات. کاتێك گەیشتەوە ماڵەوە گڵۆپــەکانی بــەردەرگای داگیرســاند، دووچــاری حەپەسان بوو! نزیکەی پەنجا کەس لە هاوڕێکــانی هــەڵ دەپــەڕین و شــادومانیان دەردەبــڕی بەیەك دەنگ دەیــان گــوت : خۆشــحاڵین بــە گەڕانــەوەت بــۆ ماڵــەوە ! کوڕەکــە ســەیری دەورووبەری ژوورەکەی کرد چاوەکانی باوەڕیان نەدەکرد. هەر پــەنجا هاوڕێکــەی ســەریان تاشی بوو ! ئایا خۆشحاڵ نابین کە هاوڕێ گەلێکی وەهامــان هــەبێت بایــەخمان پــێ بــدەن و ئازارەکانمان تــێ بگــەن و ســۆزدار بــن لەگــەڵمان بەڕادەیــەك قوربــانی بــدەن بەهەرشــتێك هەرچەندە کەم بێت یان بچوك بێت مادام هەستمان بجوڵێنێ و شادی و خۆش بــەختیمان بــۆ بێنێ ؟ زۆر سەختە لە ڕۆژانی ئەمرۆدا نموونەی ئەو هاوڕێ گەلەت دەست کەوێ.

# خەڵکیت خۆش بوێت وەکو خۆیان



ئەم چیرۆکە دەربارەی سەربازێکە بەم دواییە گەڕایەوە خاکی نیشتمان دوای ئەوەی لە جەنگی ڤێتنام بەشداری کردبوو. ئەوە بوو لە سان فرانسیسکۆ وە پەیوەندی بە دایک و باوکیەوە کردو پێ ی گوتن : ئەوا من دەگەڕێمەوە ماڵ بەڵام داواکاریەکم هەیە لێتان. هاوڕێیەکم هەیە دەمەوێ لەگەڵ خۆم بیهێنمەوە ماڵەوە، دایك و باوکەکەی : بەدڵنیاییەوە... ئێمەش پێمان خۆشە چاومان پێ ی بکەوێ و بیبینین... کوڕەکە گوتی :بەڵام شتێك هەیە پێویستە بیزانن، هاوڕێکەم لە جەنگدا دووچاری پێکان هاتووە بە سەختی و دەست و قاچێکی لەدەست داوە، هیچ جێگایەك نیە بۆی بڕوات بۆیە من دەمەوێت لەگەڵ خۆم بیهێنمەوە بۆ ئەوەی لەگەڵ ئێمەدا بژی.. باوکەکەی لەوەڵام دا وتی : پێم ناخۆشە ئەوە دەبیستم لە تۆ دەکرێ هاوکاری بکەین بۆ دۆزینەوەی شوێنێك تاکو لێی بژی.. کوڕەکەی گوتی : نەخێر بابەگیان من دەمەوێ لەگەڵ ئێمەدا بژی.. باوکەکە گوتی : کوڕەکەم! تۆنازانی ئەم کارە چەند سەختە، پیاوێك بەم کەم ئەندامیەوە دەبێتە ئەرك بەسەرمانەوە، ئێمە خاوەن ژیانی خۆمانین ناتوانین ئەرکی ئەوە هەڵبگرین کەسێکی تر بێنە ناو ژیانی تایبەتیمانەوە، لەو باوەڕەدام بگەڕێیتەوە ماڵەوە و واز لەو پیاوە بهێنی باخۆی چارەسەری دەردی خۆی بکات و هۆکارێك بدۆزێتەوە کەبایەخ بە ژیانی بدات. لەو ساتەدا پەیوەندیەکە دەپچڕێ و دایك و باوکەکە لەوە زیاتر هیچی تر نابیستن. بەڵام دوای چەند ڕۆژێك لەلایەن پۆلیسی فرانسیسکۆ وە پەیوەندیان پێوە کرا و پێ یان گوترا : کوڕەکەتان مردووە پاش ئەوەی لەیەکێك لەباڵەخانەکان کەوتۆتە خوارەوە و پێ دەچێت خۆی کوشتبێت. دایك و باوکەکە

بە هەڵەداوان بەرەو سان فرانسیسکۆ کەوتنە ڕێ و بران بۆ شوێنی تایبەتی جەنازەکان بۆئەوەی تەرمی کوڕە مردووەکەیان بناسنەوە. لەوێ تەرمەکەیان ناسیەوە. بەڵام ئەوشتەی تۆقاندنی ئەوە بوو شتێکیان بۆ دەرکەوت کە پێشتر نەیان زانیوە. کوڕەکەیان تەنها دەست و قاچێکی هەبوو !!! ئەم باوك و دایکەی لەم بەسەرهاتە دایە جیاوازنین لەگەڵ زۆرێك لە ئێمە. بەسانایی ئەوانەمان خۆش دەوێ کە ڕوخسار جوان و کەشخەن و لە ژیانێکی خۆش و بەختەوەریدان، بەڵام حەز بەو کەسانە ناکەین کەوامان لێ دەکەن هەست بەدڵتەنگی و بەزەیی یان بێزاری بکەین.

لەزۆربەی کات پێمان باشە لەو خەڵکانە دوور بکەوینەوە کەخاوەنی تەندروستیەکی باش و جەستەیەکی ڕێك و پێك و زیرەکیەك نین کە ئێمە هەمانە. کەسانی ترتان خۆش بوێ هەر وەکو خۆیان هەن !!ئەوە پەیامەکەیە.

# سندوقی زێڕین



باوکێك کیژە تەمەن چوارساڵیەکەی سزادا چونکە کۆمەڵـە کاغـەزێکی بـەرگ کردنـی زێڕینی خراپ کردبوو. باوکەکە زۆر تورە بوو کاتێك بـینی منداڵەکـەی هـەوڵ دەدات ئـەو سندوقە برازێنێتەوە کەدەیەوێ لـەژێر درەخـتی لـەدایك بـوون دای بـنێ. لەگـەڵ ئـەوش دا کچەکە بۆ بەیانی ڕۆژی دووەم سندوقەکەی دایە دەستی باوکی و پێی گوت : ئـەوە بـۆ تـۆ باوکی خۆشەویستم !

باوکەکە هەستی بە شەرمەزاری کرد پەشیمان بوەوە لەو کاردانەوە بەپەلەی نواندی بـەڵام لە پڕتاو بە تورەیی بەرزکی گرت کاتێك بۆی دەرکەوت کە سندوقەکە هیچی تێدا نیە !

بۆیە هاواری بەسـەر منداڵەکەیـدا کـرد : ئـەی تـۆ نـازانی کاتێـك پاکـەتێك پێـشکەشی هەرکەسێك دەکەی پێویستە شتێکی تیـدابێت ؟ منداڵـە بـچوکەکە سـەیری بـاوکی کـرد و فرمێسك لە چاوەکانی هۆن هۆن دەهاتە خوارەوە و گوتی : باوکە.. ئەوە بـۆش نیـە.. بـێ گومان ماچەکانی خۆمم بۆ تۆ ناردووە !..

لەو سات‌ەدا باوکەکە هەستی بە تێشکان کرد. منداڵەکەی بەهەردوو دەستی گرتە بـاوەش و لێ ی پاڕایەوە کە بیبەخشێ !

دەڵێن ئەو پیاوە ماوەی چەندین ساڵ ئەو سندوقە زێڕینەی لە تەنیشت جێگـای خەوتنیـەوە پاراستووە، هەرکاتێك هەستی بـە شکـست بکردایـە دەچـووە لای سـندوقەکەو ئـەو ماچـە

خەیاڵیانەی دەردەهێنا و بیری لە خۆشەویستی ئەو منداڵە دەکردەوە کەلەناو لەو سندوقە دایانابوو.

لەڕاستی دا هەریەك لە ئێمەی گرۆهی ئادەمیزاد سندوقێکی زێڕینی پڕ لە خۆشەویستی بێ مەرج و ماچی منداڵەکانمان و ئاکەکانی خێزان و هاوڕێ و ناسیاوەکانمانی پێ دراوە. بێ گومان هیچ کەس ناتوانێ شتێکی لەوە گرانتر و بە نرخ تر لەو خۆشەویستیە بەدەست بهێنێت.

# پەپولە



ڕۆژێکیان پیاوێك پەپولەیەکی بینی دەگەوزا لە قۆزاخەکەیدا. دانیشت و ماوەی چەند کاتژمێرێك چاو دێری کرد لە کاتێکدا هەوڵ و تەقەلای دەدا تاکو بتوانێ لە کونێکی بچوکی قۆزاخەکەوە بێتەدەرەوە، لەپاشان بۆی دەرکەوت کەناتوانێ هیچ پێشکەوتنێك بەدەست بێنێ، ئاشکرا بور کە هیچ توانایەکی نەمابوو زیاتر لەوەی ئەنجامی دا بوو. بۆیە پیاوەکە بڕیاری دا هاریکاری پەپولەکە بکات. مقەسێکی هێناو ئەو بەشەی مابووەوە لە قۆزاخەکە بڕی. دوای ئەوە پەپولەکە بە ئاسانی هاتە دەرەوە. بەلاّم وا دیار بوو هەموو جەستەی کوترا بوو و باڵە بچوکەکانی وەریبون. پیاوەکە بەردەوام بوو لە چاودێری کردنی پەپولەکە چونکە پێی وابوو ساتێك دێت باڵەکانی گەورەبن و فراوان بن بە جۆرێك بتوانن جەستەی هەڵبگرن. بەلاّم شتێکی لەم جۆرە ڕووی نەدا ! و لە ڕاستی دا پەپولەکە پاشماوەی ژیانی بە خشاندن و سوڕانەوەی جەستەی بەسەر برد بۆ هەتا هەتایە نەی توانی جارێکی تر بفرێتەوە ، ئەوەی کە پیاوەکە تێ ی نەگەیشت سەرەڕای سۆزداری و هەڵپەکردن ئەوە بوو کە قۆزاخە گیر خواردوەکە و گیانی ووره بەرزی خواز راو بوو پەپولەکە دەری خات بۆ ئەوەی لە دەرچە بچوکەکەیەوە تاکە ڕێگە چارەی دەرباز بورن جێ بەجێ بکات کە لەو میانەوە پەپولەکە شلەی ناو جەستەی لە میانەی باڵەکانیەوە دەردەدات تا بتوانێ بفرێت ئەویش بە ئازاد بوونی و دەرچوونی لە قۆزاخەکە.

لە زۆربەی کاتەکان وورەی بەرز ئەوچەکەیە کە پێویستمان پێ یەتی لەم ژیانەدا. ئەگەر لەژیانمان دا بەبێ کێشە و گیروگرفت و کۆسپ بژیابایین دووچاری ئەهامەتی و ئیفلیج بوون دەبووین و بەهێزو وورە بەرز نەدەبووین، ئەمان دەتوانی بفرین!..

# بەسەرهاتی پشتێنی ڕەش



دوای ماوەیەکی درێژ لە ڕاهێنان و مەشقکردنی سەخت و دژوار یەکێك لە ڕاهێنەرەکان لەیاری بەرگری کردن لە خۆ توانی پشتێنی ڕەش بەدەست بهێنێ، لە ڕۆژی ئاهەنگ گێڕانی خەڵات کردنەکەو لەبەردەم ئامادەبووان ڕاهێنەرەکە پرسیاری لە ڕاهێنراوەکە کردو گوتی : پشتێنی ڕەش بۆ تۆ چ واتایەك دەبەخشی؟ ئەویش وەڵامی دایەوە : پشتێنی ڕەش واتای بەرزترین ئاستە لەم یاریەدا، ڕاهێنەرەکە پێی گوت : تۆ شایەنی ئەم پشتێنە نیت، بڕۆ ساڵی ئاینده وەرەوە.

لە ساڵی داهاتوودا لەبەردەم ئامادەبووان ڕاهێنەرەکە پرسیاری لە ڕاهێنراوەکە کردو پێی گوت : بۆ تۆ پشتێنی ڕەش مانای چی دەگەیەنێت ؟ ئەویش لەوەڵامدا گوتی : پشتێنی ڕەش مانای هێزو متمانەو نەبەردی یە، ڕاهێنەرەکەش پێی گوت تۆ شایەنی ئەم پشتێنە نیت، بڕۆ ساڵێکی تر وەرەوە. لە ساڵی سێیەم ولەبەردەم ئامادەبووان جارێکی تر ڕاهێنەر پرسیاری کردەوە لە ڕاهێنراو: پشتێنی ڕەش بۆ تۆ واتای چی دەگەیەنێت ؟ ڕاهێنراوەکەش لە وەڵامدا گوتی : پشتێنی ڕەش مانای سەرەتای ڕێگاو تێ کۆشانە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکان و پێشخستنی خودی و بەرەو پێشەوە چون، ڕاهێنەرەکە گوتی : ئێستا شایەنی پشتێنی ڕەشی بێ گومان مانای پشتێنی ڕەشت زانی.

## تانە(لێدان)



لەبنەماکانی بەرنامە ڕێژی زمانەوانی دەمارگیری بەرئەنجام (دیاری کردنی ئامانج) یان بەواتایەکی دیکە چیم دەوێ بۆ ئەم ئامانجە هەندێ مەرج هەیە کە ئەرێ نیە کانیان باس دەکەین، بەمانای دەبێ ئامانجەکە ئەرێنی بێت و بتگۆڕێ و کاریگەری لەسەر کەسانی تریش هەبێت و بەرپرسیارێتی ئەو کارەت هەڵبگری کە خوازیاری ئەنجامی بدەی و سەرزەنشتی خەڵکی تر نەکەی و ڕوون و ئاشکرابێت ، چیم دەوێ ؟ کەی دەمەوێ ؟ بۆچی دەمەوێ ؟ ئەو داهاتانە چین کە پێویستم پێ یانە؟ وە ئەم پرسیارانەش لە خۆت بکەی ( چی ڕوودەدات ئەگەر ئامانجەکەت هاتە دی، چی ڕوونادات ئەگەر ئامانجەکەت هێنایە دی ؟ چی ڕوودەدات ئەگەر ئامانجەکەت نەهاتە دی چی ڕوونادات ئەگەر ئامانجەکەت نەهاتە دی ؟

پرسیاری باشترین وەڵامی باشترین وەردەگرێ و جیاوازی لە نێوان خەڵکدا بریتی یە لە جیاوازی لە نێوان پرسیارەکانیان و سەرکەوتووان ئەوانەن باشترین پرسیار لە خۆیان دەکەن (مارك توین) دەڵێت : (کاری ڕاست و دروست ئەنجام بدە چونکە وا لە هەندێ کەس دەکات توندو تۆڵ بن لە کاتێکدا ئەوانی تر سەرسام دەبن ).

# مامۆستا بەساڵاچوەکە



لەیەکێك لە زانکۆکان هەندێك لە دەرچووان لە ماڵی مامۆستا بەساڵاچوەکەیان کۆبونەوە دوای چەندین ساڵ لەبەجێ هێشتنی هۆڵەکانی خوێندن و پاش ئەوەی لەژیانی ڕۆژانەیان سەرکەوتنی گەورەیان بەدەست هێنا بوو و پۆست و پلەی باڵایان هەبوو لەژیانێکی کۆمەڵایەتی و گوزەرانی خۆش دەژیان، دوای چەندین قسەو سلاو و بە خێر هاتن هەریەك لەوانە بێزاری خۆی دەربڕی لە سەختی کارو دژواری ژیان کە دوچاری زۆر دڵەڕاوکێ و نیگەرانی کردون. مامۆستاکە کەمێك لەبەر چاویان ون بوو پاشان گەڕایەوە دۆلکە یەك قاوەی بەدەستەوەبوو، لەگەڵ چەندین کوپی هەمە چەشن و هەمە ڕەنگ،کوپی گرانبەهای چینی، کوپی پلاسکۆ، کوپی شوشەی سادە، کوپی پلاستیك، کوپی کریستاڵ هەندێ لە کوپەکان لەو پەڕی جوانی دا بوون لە شێوە و ڕەنگدا زۆر گرانبەها بوون بەڵام هەندێ کوپی تر لەو چەشنە بوون کە لە هەمرو ماڵێکی هەژار دەست دەکەون، مامۆستا بە قوتابیەکانی گوت : فەرموون با هەریەکێك لە ئێوە کوپێك قاوە بۆخۆی لێ بکات، کاتێك هەریەك لەو قوتابیە دەرچووانە کوپێکی گرتە دەست مامۆستاکە سەرلەنوێ کەوتە قسە کردن و گوتی ئایا سەرنجتان داوە کە ئێوە تەنها کوپە جوانەکانتان هەڵبژاردووە ؟ خۆتان دوور گرتووە لە کوپە سادەکان ؟ شتێکی سروشتی یە کە یەکێك لە ئێوە سەیری باشترین بکات وە بێ گومان هەر ئەمەش هۆکاری نیگەرانی و دڵە ڕاوکێتانە ئەوەی ئێوە پێویستانە

بەراستی قاوەکەیە نەك کوپەکە ، بەلام ئێوە پێشبرکێتان کرد لەسەر کوپە جوان و گرانبەهاکان و دوای ئەوەش تێ بینیم کرد هەریەك لە ئێوە چاودێری کوپی دەستی ئەوانی دیکەی دەکرد، ئەگەر قاوەکە ژیان بێت ئەوا کارو پارەو پول و پۆستی کۆمەڵایەتی بریتین لە کوپەکان و بەم جۆرە ئەوانە تەنها ئامراز و دەوری ین کە ژیان لەخۆ دەگرن و جۆری ژیان (قاوە)کەهەروەك خۆیەتی و ناگۆڕێت کاتێك تەنها پێداگری لەسەر کوپەکە دەکەین ئەوا ئێمە دەرفەتی چێژوەرگرتن لە قاوەکە لە دەست دەدەین، بۆیە ئامۆژگاریان دەکات بایەخ بەکوپ و پیاڵەکان مەدەن وە لەجیاتی ئەوان ئامۆژگاریان دەکات چێژ لە قاوەکە وەربگرن لەڕاستیدا ئەمە دەردێکی کوشندەیە زۆرێك لە خەڵکی پێیەوە دەناڵێنن، جۆرێك لەخەڵکی هەن سوپاسگوزاری خوای گەورە ناکەن لەسەر ئەوبارەی تیایدا دەژین هەرچەندە سەرکەوتنی باشیان بەدەست هێناوە چونکە هەمیشە چاودێری دەست کەوتی کەسانی تر دەکەن.

# ئازارەکانتان لەسەر لم بنووسن و چاکەکان لەسەر بەرد هەڵ بکەنن!...



چیرۆکە کە کاتێك دەست پێ دەکات کە دوو هاورێ هەبوون لەبیابان پیاسەیان دەکرد، لەمیانەی گەشتەکەدا دوو هاورێکە بووبە مشتوومڕیان و یەکێکیان کێشای بەدەم و چاوی ئەوی تریان، ئەوەی لێی درابوو ئازاری پێگەیشت ، بەڵام بێ ئەوەی ووشەیەك بدرکێ نێ لەسەر لمەکە نووسی : ئەمڕۆ خۆشەویسترین هاورێم کێشای بە گوێمدا، هاورێکان بەردەوام بوون لە ڕۆیشتن تاکو گەیشتنە مێرگێك بۆیە بڕیاریان دا مەلە بکەن، ئەو پیاوەی لێی درا بوو قاچی لە لمی ژێر ئاوەکە گیر بوو خەریك بوو دەخنکا، بەلام هاورێکەی دەستی گرتوو لە خنکان ڕزگاری کرد. پاش ئەوەی هاورێکە لە مەرگ ڕزگاری بوو هەستا لە سەر تاشە بەردێك نووسی : ئەمڕۆ باشترین هاورێم ڕزگاری کردم لە مردن. ئەو هاورێیەی لە هاورێکەی خۆی داو ڕزگاری کرد لە مردن پرسیاری لێ کرد : بۆچی لە جاری یەکەم کاتێك لێمدایت لەسەر لم نووسیت و ێستاش کە ڕزگارم کردی لە سەرتاشە بەرد نووسیت؟ هاورێکەی لەوەڵامدا گوتی : کاتێك یەکێك ئازارمان دەدات پێویستە لەسەرمان ئەوکارەی لە سەر لم بنوسینەوە ، چونکە لە پاشان بای لێبووردەیی دەکرێ بیسڕێتەوە، بەڵام کاتێك کەسێك کارێکی چاکمان لەگەڵ دەکات پێویستە لەسەرمان ئەو

کارەی لە گەڵی دا کردوین لەسەر بەدر بنووسینەوە ، چونکە هیچ جۆرە ڕەشەبایەك ناتوانێ بیسڕێتەوە.

فێربن کە ئازارەکانتان لەسەر لم بنووسن و چاکەکان لەسەر بەرد هەڵ بکەنن !...

وە فێربن کە گیانی لێبوردەیی و پێکەوە ژیان فەراهەم کەن.

# بەردی ڕەش



دەگێڕنەوە لە دێرین زەمان و لە گوندێکی بچوکی هیندستان، جوتیارێك هەبوو پارەیەکی زۆری لەیەکێك لە پارەدارەکانی گوندەکە بە قەرز وەرگرتبوو،ئەو خاوەن قەرزە (بەساڵاچوو بوو) دەیویست هاوسەرگیری لەگەڵ کچەگەنجەکەی جوتیارەکەدا بکات، بۆیە پێشنیازی گۆڕینەوەیەکی کرد. گوتی : لە قەرزی سەر جوتیارەکە خۆش دەبێ ئەگەر کچەکەی مارە بکات، بەڵام جوتیارەکەو کچەکەی بەو پێشنیازە دۆش دامان و ڕەتیانکردەوە، ئەو کاتە خاوەن قەرزەکە پێشنیارێکی فێڵاوی کردو پێی گوتن : من دوو بەرد دەخەمە ناو تورەکەی پارەوە یەکێکی ڕەش و یەکێکی سپی تۆش یەکێك لە بەردەکان ڕاکێشە لەناو تورەگەکە ، ئەگەر بەردە ڕەشەکەت ڕاکێشا، ئەوا هاوسەرگیریت لەگەڵ دەکەم و لە قەرزی باوکت خۆش دەبم.

ئەگەر بەردە سپیەکەت دەرهێنا، ئەوا هاوسەرگیریت لەگەڵ ناکەم و لە قەرزی باوکت خۆش دەبم ، بەڵام ئەگەر هیچ کام لەبەردەکانت ڕانەکێشاو سور بووی لەسەر ڕەتکردنەوەی، ئەوا باوکت زیندانی دەکەم.

کاتی جێبەجێ کردنی پێشنیارەکە هات و هەمووان وەستا بوون لەسەر ئەو ڕاڕەوە کە بە چەو ڕاخرابوو دەچووە زەوی جوتیارەکە، موشتوو مڕ هەر بەردەوام بوو، پارە دارەکە بە

گورجی چەمایەوەو دوو بەردی هەڵگرتەوە. کچەکە زۆر بە وورییەوە چاوی لەسەر خاوەن قەرزەکە بوو خاوەن قەرزەکە دووبەردی ڕەشی بەپەلە هەڵگرتوو خستیە تورەگەکەوە بێ ئەوەی کەس تێ بی نی بکات، ئینجا خاوەن قەرزەکە قسەکانی بڕی و داوای لە کچەکە کرد یە کێك لە بەردەکانی ناو تورەگەکە ڕابکێشێت. ئێستا کەوا بزانە تۆ لەوێدا وەستاوی، چۆن ئامۆژگاری کچەکە دەکەی ؟؟؟ بێگومان پێی دەڵێی :

١- ڕاکێشانی بەردەکە ڕەت بکاتەو بێ ئەوەی هۆکارەکەی بڵێ.

٢-ئەو فێڵە ئاشکرا بکەی کە دووبەردی ڕەش لەناو تورەگەی پارەکە دایەو ڕای بگەیەنێ کە خاوەن قەرزەکە ساختەکاروو فێڵبازە.

٣-بەردە ڕەشەکە دەربهێنێ و خۆی بکات بە قوربانی باوکی تاکو لە قەرزو زیندان ڕزگاری بێت.

بەڵام بیر بکەرەوە لەو دەرئەنجامانەی ڕوودەدەن ، ئەگەر کچەکە یەکێك لەو پێشنیارانەی هەڵبژاردن :

١-ئەگەر ڕاکێشانی بەردەکە ڕەت بکاتەوە – باوکی زیندانی دەکرێت.

٢- ئەگەر ساختەکاری خاوەن قەرزەکە ئاشکرا بکات –دووبارە باوکی زیندانی دەکرێت.

٣- ئەگەر قوربانی داو بەردە ڕەشەکەی ڕاکێشا تا کو باوکی ڕزگار بکات لە قەرزو زیندان ، ئەوا هاوسەر گیری دەکات. سەیرکە ئەو کچە زیرەکە چی دەکات ؟؟؟... کچەکە دەستی خستە ناو تورەگەی پارەکەوەو یەکێك لەبەردەکانی ڕاکێشا بێ ئەوەی دەستی بکاتەوەو تەمەشای ڕەنگی بەردەکە بکات. ئینجا بە ئەنقەست خۆی پەشۆکاند بۆ ئەوەی بەردەکە لەدەستی بکەوێتە خوارەوە لەو ڕاڕەوە کە پڕیەتی لەو جۆرە بەردە لە هەموو ڕەنگ. بەمەش ئەستەم دەبێت کە ڕەنگی ئەو بەردە دڵنیابێ کە کچەکە دەری هێناوە. لەپاشان کچەکە گوتی : بەداخەوە ئەی خوایە بەرم دایەوە... بەڵام کێشە نیە دەتوانین ڕەنگی ئەو بەردە بزانین کە لە دەستم کەوتە خوارەوە بە سەیرکردنی ڕەنگی بەردەکەی تر کە لەناو تورەکەکەدایە. وە بێ گومان لەبەرئەوەی ئەو بەردەی ماوە ڕەشە، ئەوا هەمووان پێ یان وایە

کە ئەو بەردە سپیەکەی ڕاکێشاوە. بەم شێوەیە خاوەن قەرزەکە هیچ گومانی نەما بۆ جێ بەجێ کردنی ئەو شتەی خۆی پێ پابەند کردبوو لەبەردەم هەمووان و لە قەرزی جوتیارەکە خۆش بێت بێ ئەوەی هاوسەرگیری لەگەڵ کچەکەی دا بکات.

ئەم بەسەرهاتە باس دەکرێ تاوەکو بزانین گرفت و دەردی سەری هەر چەند قورس بێت ئەوا چارەو دەرباز بوون لیێ ی هەر دەبێت گەر بەباشی بیربکەینەوە.

ئەوەتا کچەکە لە هەڵوێستێك دەرچوو کەوا دیار بوو ئەستەم بێ مامەڵەی لەگەڵ بکرێ بەرەو هەڵوێستێك کەتا ئەو پەڕی سنور بە سوود بوو، وە ئەمەش بە بیرکردنەوەیەکی نائاسایی..

# چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك



پیاوێك سێ منداڵی هەبوو، ویستی خوای گەورە وابوو خێزانەکەی کۆچی دوایی کرد... ئەو پیاوەش هەستا بە پەروەردەکردنی سێ منداڵەکەی و بە خێوکردنیان و گرینگی پێ دانیان تا وەکو گەورە بوون و هەموویان هاوسەرگیریان کرد، هەریەك لە کوڕەکانی خانووی خۆی هەبوو لەگەڵ هاوسەرەکانیان دەژیان و باوکیان لەماڵەکەیدا بەتەنها جێ هێشت...

پاکو بێ گەردی بۆ خوای گەورە ڕۆژێك لە ڕۆژان لەدەرەوەی ماڵەکەی دانیشتبوو دراوسێ کەی پرسیاری کرد : دەتبینم دراوسێکەم غەم باری ئەوەچیتە ؟ بەڵکو بتوانم یارمەتیت بدەم. پیاوی خاوەن سێ کوڕەکە پێ ی گوت : من سێ کوڕم هەیە پاکو بێ گەردی بۆ خوای گەورە هەموویان ژنیان هێناوە و هەموو ڕۆژێ دێن بۆلام ، بەڵام گرینگی بە پاکو خاوێنی ماڵەکەم نادەن و خواردنم بۆ ناهێنن داوای لێ خۆش بوون لەخوا دەکەم... بەم جۆرە دراوسێ بەسەرهاتی درێژی خۆی بۆ هاوڕێکەی باس دەکات... دوای ئەوە : هاوڕێکەی پێ ی گوت : پاکو بێ گەردی بۆخوای گەورە : من نەخشەیەکت بۆ دادەنێم لەو کێشەیە ڕزگارت بکات.. پیاوەکە گوتی : پێم بڵێ چیە خوای گەورە پاداشتت بداتەوە ان شاءالله.. دراوسێ کەی گوتی : گۆزەیەك بێنە لە حەمامەکە دای بنێ و هەموو ڕۆژێك پیسایەکەی خۆتی تێ بکە... لەپاشان بە چیمەنتۆ سەرەکەی بگرە... باوکی سێ کوڕەکە گوتی : دوای ئەوە چی بکەم ؟... دراوسێ کەی گوتی : جارێکی تر دەت بینمەوە. بێ

گومان پیاوەکە ئامۆژگاری دراوسیّ کەی هێنا یە جیّ و هەموو ڕۆژیّ گۆزەکەی پڕدەکرد لە پاش ماوەی خۆی تاکوو پڕبوو ئینجا بە چیمەنتۆ سەرەکەی بەباشی داخست پاشان هات بۆلای دراوسیّ کەی و گوتی : چی بکەم... دراوسێکەی داوای لیّ کرد هەر ڕۆژەو یەکیّ لە کوڕەکانی بانگ بکات، یەکەم، ئینجا دووەم، دواتر سێیەم بەمەرجێك هیچ کامێکیان بە وی تریان نەزانێت و بەوی تر نەڵێت. بەکوڕی یەکەم دەڵێت : کوڕی شیرینم بزانە من لەو دونیایە هیچ شك نابەم تەنها ئەو گۆزەیە نەبێت کە لەژێر جێگاکەم دایە... پاش من گرینگی پیّ بدە. بەو شێوەیە هەر ڕۆژەی بەیەکێك لە کوڕەکانی دەڵێت... بەم شێوەیە پیاوەکە ڕۆیشت و کوڕی یەکەمی بانگ کردوو ئینجا دووەم و پاشان سیّ هەمیان... لەو کاتەوەی باوکەکە ئەم شتەی بەسیّ کوڕەکەی گوت بەربەرەکانی کەوتە نێوان سیّ کوڕەکەو هاوسەرەکانیان،پاکو بیّ گەردی بۆ خوای گەورە، هەموو ڕۆژێك یەکێکیان خواردنیان بۆ دەهێناو هاو سەرەکانیان جلو بەرگیان بۆ دە شۆرد و ماڵەکەشیان بۆ پاك دەکردەوە... بەم شیّ وەیە باوکەکەیان زۆر دڵ خۆش بوو لەم بیرۆکەیەو سوپاسی دراوسیّ کەی کرد .ڕۆژێك لە ڕۆژان باوکەکە زۆر نا ساغ بوو هەرسیّ کوڕەکەی هاتن و لەسەر باوکیان دەگریان کە لەسەر جێگا کەوتبوو، هەریەکەیان دەیگوت : خوا شیفات بدات و چاویان لەسەر گۆزەکەبوو، کوڕی دووەمیش بەم شێوەیە چاوی لەسەر گۆزەکەبوو و خەونی بە ماڵی دونیاو دۆڵەمەندیەوە دەبینی... هەروەها سیّ هەمیشیان. دوای ئەوەی باوکیان مرد ناکۆکی کەوتە نێوان سیّ کوڕەکەی و هەریەکەیان دەیگوت باوکم ئەو گۆزەیەی داوە بەمن.. دوای ئەوە سیّ براکە ڕێکەوتن کە بچن بۆ لای دادوەر تاکو دادوەریان لە نێوان دا بکات... کاتێك چوون بۆ لای دادوەر...تاوەکو دادوەریان لە نێوان دا بکات، دادوەرەکە مێزەرێکی لەسەر بوو گوتی : من دادەنیشم و گۆزەکە دەخەمە سەرسەرم و لە گۆزەکە دەدەن تاکو دەشکێت... بەڵام بەمەرجێك نەکەوێتە سەرجلەکانم... بەم جۆرە سیّ براکە ڕازی بوون... گۆزەکەیان لەسەرسەری دادوەر دانا و شکاندیان ئەوەی لە ناو گۆزەکەدابوو کەوتە سەر سەری دادوەر و دەستی هەرسیّ براکەش پیس بوو.... بیّ گومان

دەزانین چی تێدا بوو.

پەندو ئامۆژگاری لەم چیرۆکەدا :

١-چاکە کردن لەگەڵ دایك و باوك چونکە خوای گەورە دەفەرمووێ "لەگەڵ دایـك و باوکتان چاك بن ".

٢-خوای گەورە دەفەرمووێ : ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتـان هێنـاوە لـە خـوا بترسـن و پارێزکار بن با هەرکەسێك بزانی چی ئامادە کردووە بۆ سـبەی و لـە خـوا بترسـن چـونکە خوای گەورە ئاگادارە بـەوەی ئـەنجامی دەدەن... خـوای گـەورە لـە ڕۆژی دوایـی دا لـە گوناهەکانمان خۆش ببە.

# باوکی عبدالله



پیاوێك هەبوو ناوی باوکی عبدالله بوو پیاوێکی لەخوا ترس و بەندەیەکی سوپاس گوزاری خودا خێزاندار بوو سێ کوڕی هەبوو لەگەڵ خێزانەکەی لە شوقەیەکی باڵەخانەیەکدا نیشتەجێ بوون هەردەم لە مزگەوت بوو خوا پەرستی دەکرد... هەموو بەیانیەك لەگەڵ گوێ بیستبونی بانگی بەیانی لەگەڵ کوڕکانی دەچوونە مزگەوت بۆ ئەنجام دانی نوێژ لەکاتی خۆی دا... ئەولەگەڵ دراوسێکانی زۆر باش بوو هەمیشە پرسیاری لێدەکردن و بەشداری خەمە کانی دەکردن یەکێك لە دراوسێکانی باوکی عبدالله دەڵێت من نوێژی بەیانیم لە مزگەوت نەدەکرد ڕۆژێکیان کاتژمێر ٤ ی بەیانی بوو لە زەنگی دەرگا درا بەلامەوە نائاسایی بوو بە کوڕەکەم گوت دەرگاکە بکەرەوە بزانە کێیە کاتێك کوڕەکەم دەرگاکەی کردەوە بینیم عبدالله ی کوڕ ی ئەو پیاوە خوا ناسەیە پاکەتێك نۆك و پاکەتێك پاقلەی بە دەستەوەیە لەسەر کاغەزێك نوسراوە ﴿ إن الصلاە کانت علی المؤمنین کتاباً موقوتاً ﴾ وە لەسەر کاغەزی دووەم نوسراوە ﴿ إن الصلاە تنهی عن الفحشاو والمنکر﴾ دوای ئەم شێوازە جوان و ڕەوشت بەرزییە پیاوەکە سوێندی خوارد کە هەر پێنج نوێژەکە لە مزگەوت بکات بەلاّم ئەو دراوسێیەی جلی بالاّ پۆشی لەبەر نەدەکرد دەڵێت ڕۆژێکیان لەگەڵ کچە پێنج سالاّنەکەی لە قادرمەکان دەهاتە خوارەوەو کچەکەی لە پێشیەوە دەڕۆیشت لە هاتنە خوارەوە لەقادرمەکان لەو کاتە دا باوکی عبدالله سەردەکەوت کاتێك ئەوانی بینی سلاّوی لێ کرد باوکی عبدالله سەری نەوی کردو دەستی لەسەر سەری کچەکە داناو پێی گوت :

خوا بت پارێزێ قژی چەند جوانە ئەگەر بێت و بە باڵاپۆش لە چاوی خەڵکی نا حەز پارێزێت لێرەدا هاوسێکەی تێگەیشت کە مەبەستی کچەکەی نیە بەڵکو قسەکە ئاراستەی خودی ئەو کراوە ئەو ژنە دەڵێت چەندین ڕۆژ بیرم لەو ووتەیە دەکردەوە تاکو دوا جار بڕیارم دا باڵا پۆش بم دوای چەند ڕۆژێك خێزانی باوکی عبداللە لەگەڵ منداڵەکانی چوون بۆ دەرەوەی وڵات و باوکی عبداللە لەماڵەوە مایەوە پاش دوو ڕۆژ لە دراوسێکانی ون بوو بە جۆرێك پێنج نوێژە فەرزەکەی لە مزگەوتی گەڕەکەکە نەدەکرد ئوتۆمبیلەکەشی لە بەردەم دەرگا وەستا بوو دراوسێکانی چەندین جار لە دەرگایان دا بەڵام هیچ وەڵامێك لەبوو پرسیاریان لە دراو سێکانی تریش کرد بە لکو یەکێکیان ئەم ڕۆژە بینبیێتی یان شتێکی لەبارەوە بزانێت وەدوای ئەوە ترسان کە شتێکی خراپی بەسەر هاتبێ بۆیە دراوسێکانی چونە لای پۆلیس بەسەرهاتەکەیان بۆ گێڕانەوە ئەفسەری پۆلیس بڕیاری دا دوو پۆلیس و دوو پزیشك کە یەکێکیان ڕەگەزنامەی کوێتی بوو پیاوێکی دیندار بوو ئەویتریشیان لوبنانی مەسیحی بوو تازە ببووە پزیشك و لە پزیشکی شەرعی ڕاهێنانی دەکرد لەگەڵیان بچن هەموویان بەرەو شوقەکەی باوکی عبداللە ڕۆیشتن ئەفسەرەکە فەرمانی کرد بەیەکێك لە پۆلیسەکان دەرگاکە بشکێنێت ئەمەش دوای ئەوەی زۆریان لەدەرگاکە داو کەس وەڵامی نەدایەوە پۆلیسەکە دەرگای شوقەکەی شکاند تاکو دەرگاکە کرایەوە لێرەدا سە رسام بوون کاتێك بینیان باوکی عبداللە لەبەردەمیان دانیشتووە لەسەر دۆشەك و ڕوی کردۆتە ئاسمان بە قورئانی پیرۆز دەمو چاوی داپۆشی وە دراوسێ کەی هاواری کرد گوتی : ئای باوکی عبداللە ئەفسەرەکە هەستا بەدوور خستنەوەی کەسەکە بۆدەرەوەی شوقەکەو فەرمانی کرد پزیشکەکان بچنە پێشەوە پزیشکە کوێتیەکە بە پزیشکە لوبنانیەکەی گوت فەرموو دکتۆر ئەمڕۆ ڕۆڵی تۆیە کاری خۆت ئەنجام بدە پزیشکە لوبنانیەکە لەباوکی عبداللە نزیك بۆوە پزیشکە کوێتیەکە بەپزیشکە لوبنانیەکەی گوت : ساتێك چاوەڕێ بکە قورئانەکەی لەدەستی باوکی عبداللە وەرگرت ، چونکە لەوە ترسا هاوڕێ پزیشکەکەی دەستی لێ بدات بێ گومان پزیشکە لوبنانیەکە بە ووردی سەیری دەم و چاوی باوکی عبداللە ی دەکردوو

سەرنجی دەدا... تەنها چەند چرکەیەك بوو... سەرجەم ئامادەبووان گوێبیستی پزیشکە لوبنانیەکە بوون کاتێك بەدەنگی بەرز گوتی : شایەتی دەدەم کە هیچ خوایەك نیە جگە لە الله نەبێ وە شایەتی دەدەم کە محمد نێردراوو پەیامبەری خودایە... ئینجا دەستی کرد بە پشکنینی دڵ ی باوکی عبدالله کە گەڕابویەوە بەر ڕەحمەتی خودای گەورە... هەموویان چونە پێشەوەو بەتایبەتیش هاورێکەی پزیشکە کوێتیەکە... چۆن ئەو دەڵێت ئەوە مەسیحیە ئایا ئەو مسوڵمان بووە یاخود بەشێوەیەکی بێ ئاگایانە ئەم ووتەیە لەدەمی دەرچوو لێرەدا پزیشکە کوێتیەکە سەرسام بوو ئایا واز لە پزیشکەکە بێنێت بەردەوام بێت لە پشکنینی باوکی عبدالله یاخود پرسیاری ئەوەی لێبکات کەچی گوتووە... چەند چرکە ساتێك و پزیشکە لوبنانیەکە دەستی بە گریان کردو ئەم دیمەنە زۆر کاری تێکرد. لەو ساتەوەختەدا هاورێ پزیشکە کوێتیەکەی هاتە قسەو پێی گوت : بۆچی دەگری ئەم پیاوە نزیکی تۆبە ؟ یان چیتە ؟... پزیشکە لوبنانیەکە گوتی : نەخێ وەالله ی ئەوەی من کە ئەو ڕۆکە دیومە لە دەم و چاوی ئەم پیاوە لەو نورەی وەکو مانگەشەو وابوو دەدرەوشایەوە... گومانم ئەما من پێشتر لە تاریکی دا ژیاوم... لێرەدا هەمووان دایانە پرمەی گریان هاو سێکانی باوکی عبدالله و پزیشکە کەوێتیەکەو پزیشکە لوبنانیەکە. سوپاس بۆ ئەو خوایەی کەباوکی عبدالله ی مراند کە کۆتایی ژیانی باوەشی کردبوو بە قورئانی خوای گەورە... وە سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی پزیشکێکی مەسیحی مسوڵمان بوو لەسەر دەستی باوکی عبدالله ئەمەش دوای کۆچکردنی.

# پایسكل سوار



هاوڵاتیەكی بەلجیكی بەدرێژایی بیست ساڵ ڕۆژانە لە سنور دەپەڕیەوە بەرەو ئەڵمانیا بەسواری پاسكیلەكەی كە جانتایەكی پڕ خۆڵی بە كۆڵەوە بوو، پاسەوانانی سەرسنوری ئەڵمانیا دڵنیابوون كە ئەو پیاوە شتێك بەقاچاغ دەباتە دەرەوە بەڵام هەموو جارێك بێجگە لەخۆڵ هیچی تریان نەدەبینی كە پێی بێت. نهێنی ڕاستەقینە دەرنەكەوت تەنها پاش مردنی بەرێز دیستان نەبێت كاتێك لەیاداشتەكانی ئەم ڕستەیە نووسرابوو دۆزرایەوە : تەنانەت هاوسەرەكەشم نەی زانیوە كەمن ئەو سامانەم بە هێنانی پاسكیل بۆ ئەڵمانیا بە قاچاغی بەدەست هێناوە.

(ئەوەی جێگەی سەرنج و تێ ڕامانە لێرەدا زیرەكی ئەو پیاوە بوو كە (خۆڵی كردۆتە چاوەكانەوە و سەرنج و تێ ڕوانینی خەڵكی لەسەر ئامانجە ڕاستە قینەكەی لاداوە).

## دەستپێشخەری



حوزەیفەی کوڕی یەمان دەڵێت : پێغەمبەری خوا بانگی کردم کاتێك ئێمە لە غەزای خەندەق بووین و پێ ی گوتم : برۆ ناو سەربازگەی قورەیشیەکان و بزانە چی دەکەن، منیش ڕۆشتمە ناو یان (ڕەشەباکە وۆر بەهێزبوو کەبواری نەدەدا کەس کەس بناسێتەوە ) ئەبو سوفیان گوتی : ئەی گرۆی قورەیش هەرکەس بڕوانێ لەگەڵ کێ دانیشتووە ( لەترسی سیخوڕ و کەسانی نامۆ کەهاتبنە ناوتانەوە ) حوزەیفە گوتی : دەستی ئەو پیاوەم گرت کە لە تەنیشتمەوە بوو و گووتم : ئەی پیاو تۆ کێ ی ؟ ئەویش بەپەشۆکاوییەوە گوتی : من فلانی کوڕی فلانم..

خالی زیرەکی لێرەدا ئەوەیە...( جلەو گرتنی دەستپێشخەری و بە متمانەوە مامەڵەکردن لە گومان دوورت دەخاتەوە ؟..)

## شەربەی ئاو



ئەبو حەنیفە ڕۆژێك دەدواو گوتی : پێویستم بوئاو هەبوو لە لادێیەك، کابرایەکی دەشتەکی دەڕۆیشت کە شەربەیەك ئاوی پێ بوو داوام لێ کرد نەیدامێ و پێداگری کرد کە پێنج درهەم پێم بفرۆشێ منیش پارەکەم دایەو هیچی تریشم پێ نەما.. و دوای ئەوەی تێرئاو بووم گوتم ئەی کابرای دەشتەکی نان ناخۆی ؟ ئەویش گوتی: بەڵێ بێنە.. منیش ئەو نانە ڕەقەم پێ ی داو خواردی تا تینوی بوو، ئینجا گوتی : قومێك ئاوم بدەرێ ؟ منیش گوتم : جامێك بە پێنج درهەم، پارەکەم لێ وەرگرتەوە و شەربەکەشم بۆخۆم هەڵگرت.

(خاڵی زیرەکی لێرەدا ئەوەیە : لە دڵا شاردنەوەی نیەت و دروست کردنی کەش و هەوای سەرکەوتن.)

## پشیلەی ڕەش



جوڵانەوەیەکی زیرەك هەیە کە یەکێك لە کارامە فەڕەنسی یەکان پێ ی هەستاوە.. ڕۆژێکیان کە گەڕایەوە کۆشکەکەی بە غەمباری و پەشۆکاویەوە، ژنەکەی لێ ی پرسی : چیت لێ قەوماوە، ئەویش گوتی : مارکێز کاجیلۆرۆ (کە ناسراو بوە بە فالچیەتی و جادوگەری ) پێ ی گوتم :کە تۆ لەگەڵ نزیك ترین هاوڕێم ناپاکیم لەگەڵ دەکەی منیش بێ ئاگایانە دام بە گوێ یدا.. ژنەکەی بەهێمنیەوە گوتی : ئایا من لەوە گەیشتم کە تۆ باوەڕت بەو بانگەشەیە نەکردوە ؟ ئەویش گوتی : بێگومان باوەڕم بە قسەکەی نەکردوە، بەڵام هەڕەشەی لێ کردم و گوتی : گەر قسەکەم ڕاست بوو ئەوا سبەی کە لە خەو هەستای دەبیتە پشیلەیەکی ڕەش !.. لە بەرەبەیانی ڕۆژی دواتر ژنەکە لە خەو هەستا و بینی پشیلەیەکی ڕەش لە نەنیشتیەوە خەو تووە لە ترسان قیژاندی و هاواری کرد ئینجا گەڕایەوە و لەبەردەمیدا چۆکی دادا و پۆزشی بۆ هێنایەوە و داوای لێبوردن و لێخۆش بونی کرد.. لەو ساتە وەختەدا هاوسەرەکەی لە پشت پەردەوە هاتە دەرەوە و شیرێکی ڕووتی بە دەستەوە بوو.

(پەندو ئامۆژگاری لێرەدا ئەوەیە : ئەفسانەو خوڕافاتی کەسانی تر بەدەرفەت بزانی و بیرو باوەڕیان وەها ئاراستە بکەی لە کۆتایی دا لەبەرژەوەندی تۆ دا بێت.)

# دەی زانیٚ کە ژنەکەی کوژراوە



کاتێك دەستەی دادگا خەریکی دەرکردنی فەرمانی لە سێدارەدان بوون بەسەر بکوژی ژنەکەی کەتا ئەو کات تەرمەکەی نەدۆزرابۆوە سەرەرای بەردەست بوونی هەموو بەڵگەکان کە هاوسەرەکەی تۆمەت باردەکات.. پارێزەرەکەی بەرگری بەدوای پاساوێك دادەگەرا تاکو بریکارەکەی رزگار بکات... ئینجا بەدادوەری گوت ! فەرمانی لە سێدارەدان بەسەر بکوژەکە دانادریٚ... بێگومان دەبیٚ دەستەی دادگا بە لگەی تەواویان لەبەردەست بێت و هیچ گومانێك نەبیٚ کە تۆمەت بارەکە بەراستی ژنەکەی کوشتووە .ئێستاش.. لەدەروازەی دادگاوە.. بەلگەیەکی مەزن دێتە ژوورەوە کەدەی سەلێنیٚ بریکارەکەم بێتاوانەو ژنەکەشی ساغ و سەلامەتە...!!

دەرگای دادگا کرایەوە سەرجەم ئەوانەی لە هۆڵەکەدا بوون چاوویان لە سەر دەرگا کە بوو...

پاش چەند چرکە ساتێك لە بیٚ دەنگی و چاوەروانی... کەس لە دەرگاوە نەهاتە ژوورەوە...

لێرەدا پارێزەرەکە گووتی : هەمووان چاوەروان بوون کوژراوەکە بێتە ژوورەوە !! و ئەمەش چەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئێوە لە سەدا سەد باوەرتان وانیە کە بریکارەکەم ژنەکەی خۆی کوشتووە !!!

لێرەدا هۆڵەکە ورژاو هەمووان سەرسان بوون بە زیرەکی پارێزەرەکە..

... دادوەرەکان هەڵوێستەکەیان تاوتویٚ کرد... وفەرمانی لە پرتاو دەرچوو فەرمانی لە سێدارەدان !!! چونکە گەیشتنە ئەوراستیەی کە هیچ گومان و دوو دڵیەکی تێدا نیە کە ئەو پیاوە ژنەکەی خۆی کوشتووە... دوای فەرمان دەرچوونەکە خەڵکەکە پرسیان چۆن فەرمانی

لەم جۆرە دەردەکرێ... دادوەرەکە زۆر بە سانایی وەڵامی دانەوە : کاتێك کە پارێزەرەکە بەهەمووانی ڕاگەیاند ژنەکە نەکوژراوە و ئێستاش زیندووە... هەموومان-چاومان لەسەر دەرگاکە بوو چاوەڕوانی هاتنە ژوورەوەی بووین تەنها یەك کەس نەبێ لەناو هۆڵەکە !!! ئەویش هاوسەر تۆمەت بارەکە بو ، چونکە ئەو باش دەزانێ کە ژنەکەی کوژراوە... و کەسانی مردووش ناڕۆن بەرێدا.

# قاز دز



پیاوێك هات بۆ لای حەزرەتی سولەیمان (سلاوی خوای لەسەر بێ) و پێ ی گوت: ئەی پێغەمبەری خودا ! دراوسێم هەن قازەکانم دەدزن، ئەمیش بانگەوازی کرد : بۆ نوێژ، ئینجا وتارێکی بۆ دان و لەوتارەکەدا گوتی : یەکێك لە ئێوە قازی دراوسێکەی دەدزێ، و پاشان دێتە ناو مزگەوت و پەڕموچی بەسەرەوە یە، پیاوێك دەستی بەسەری دا هێنا، حەزرەتی سولەیمان گوتی : بیبەن ئەوە هاوڕێکەتانە.

## تورەگەکە



بــە ئیمــامی شــافیعی گــوترا : پیاوێــك تورەکەیــەکی پــڕ و مــۆر کــراوی دا بــە ژنەکــەی و داوای لــێ کــرد هەرچــیەکی تێدایە بەتاڵی بکات بە مــەرجێك نەیکاتــەوە یان مۆرەکــەی بــشکێنێ یــاخود بیــسوتێنێ، ئەگەر یــەکێك لەوانــە بکــات ئــەوا تــەڵاق دراوە ؟ ئەویش گوتی : تورەگەکە پڕەبــووە لە شەکر یاخوود خوێ ژنەکە تەنها بیخاتــە ناو ئاو هەرچی تێدایە دەتوێتەوە.

## ئارامبگرە بەختەوەر دەبیت



لەگوندێك ژنێك دەچێ بۆ لای یەكێكی زانا كە پێ ی وایە جادووگەرەو داوای لێ كرد كارێكی جادوویی بۆ ئەنجام بدات بە شێوەیەك مێردەكەی خۆشی بوێت كە هیچ كەسێك لە ئافرەتانی جیهان لە گەڵیدا نەی بینێ، لەبەرئەوەی ئەم پیاوە زاناپەروەرو وشیار بووە پێ ی گوتوە تۆ داوای شتێك دەكەی كە هەروا ئاسان نیە و تۆ داوای شتێكی مەزن دەكەی ئایا تۆ ئامادەی ئەو ئەركە بگریە ئەستۆ ؟ ئەویش گوتی بەڵێ. بە ژنەكەی گوت : ئەم كارە تەواو نابێ تەنها ئەگەر بتوانی تاڵە موویەكی گەردنی شێر بهێنی، ژنەكە گوتی شێر ؟ زاناكە گوتی : بەڵێ، ژنەكە گوتی : من چۆن دەتوانم ئەو كارە بكەم كەشێر ئاژەڵێكی مەترسیدارە و ڕەنگە بمكوژێ ئایا ڕێگایەكی ئاسان تر و سەلامەت تر نی یە ؟ زاناكە پێ ی گوت : نەخێر تۆ دەتوانی ئەوەی خوازیاری بە دەستی بهێنی لە خۆشەویستی مێردەكەت تەنها بەو ڕێگایەو ئەگەر بیربكەیتەوە ئەوا ڕێگە چارەیەكی شیاو دە دۆزیتەوە بۆ هێنانەدی ئامانجەكەت.

ژنەكە ڕۆیشت بە هەڵە داوان بیری دەكردەوە چۆن بتوانێ ئەو تاڵە مووە داواكراوە بەدەست بهێنێ، بۆیە كەوتە ڕاوێژ بەوكەسانەی جێگەی متمانەی بوون لە دانایی و پێ یان ڕاگەیاند شێر پەلاماری كەس نادات تەنها ئەگەر برسی بێت بۆیە دەبێت تێری بكەیت بۆئەوەی لە شەڕی پارێزراو بیت، ژنەكە ئەم ئامۆژگارییەی وەرگرت و ڕۆیشت دارستانێكی نزیك لە خۆیان و دەستی كرد بە فرێدانی پارچە گۆشت بۆ شێرەكە و لێ ی دوور دەكەوتەوە، بەم شێوەیە بەردەوام بوو لە پێدانی گۆشت بە شێرەكە تاوەكو وای لێ هات هۆگری بوو هەرجارەی كەمێك لێ ی نزیك دەبووەوە تاكو ئەو ڕۆژەهات كە شێرەكە لە تەنیشتیەوە درێژ دەبوو كە هیچ گومان نەبوو لەوەی كە خۆشی دەوێت بۆیە دەستی لەسەر

سەری دانا و ئینجا دەستی بەسەرو گەردنی دا دەهێنا بە سۆزەوە لـە کاتێکـدا شـێرەکە لـەو پەڕی شادی و حەسانەوە دا بوو کارێکی گران نەبوو کە ژنەکە تاڵـە موویـەك زۆر بـەهێمنی لێ بکاتەوە، کاتێك زانی تاڵە مووەکەی بەدەستەوە هاتووە بە پەلە خۆی گەیاندە زاناکە کـە پێ ی وابوو جادووگەرە بۆ ئەوەی پێ ی بدات زۆر شادومان بـوو کـە تـوانی ویـەتی دڵـی مێردەکەی بەدەست بهێنێ و بۆ هەمیشە لە دڵـیدابێت کاتێـك زاناکـە تاڵـە مووەکـەی بـینی پرسیاری لێ کرد : چۆن توانیت ئەم تاڵە مووە بەدەست بهێنی چیت کردووە ؟ ژنەکەش بـە درێژی پلانی ماڵی کردنی شێرەکەی بۆ باس کرد، کە پوختەکەی بریتی بوو لە زانینی چوونە ناو دڵی شێرەکە و ئینجا تێر کردنی و لـە پاشان بەردەوامی و نارامی لەسەر ئەم کارە تا ئـەو کاتەی بەرهەمەکە دەچنێتەوە، ئـەو کـات زاناکـە پـێ ی گـوت : ئـەی ژنـی خوانـاس... مێردەکەی تۆ لەو شێرە دڕندەترنیە... چـیت لەگـەڵ شـێرەکە کـردووە ئـەو هـاش لەگـەڵ مێردەکەت ڕەفتار بکە دەبێتە مولکی تۆ و ڕێگای چوونە ناو دڵی شارەزا دە بیت و برسـێتی یەکەی مێردەکەت تێربکە دەبێتە کۆیلەی تۆ، نەخشە بۆ ئـەم کـارەت بکێـشە و ئـارامبگرە لەسەری بەختەوەر دەبیت.

# لێدان بە چەکوش



ئایا گوێ بیستی چیرۆکی بزوێنەری کەشتی یە گەورەکە بووی کە ڕۆژێکیان پەکی کەوت؟

خاوەنی کەشتیەکە هانای بۆ سەرجەم شارەزایانی ناوچەك برد بەڵام کەسێك لەوان نەیتوانی بزانێ چۆن بزوێنەرەکە چاك بکاتەوە... لەپاشان پیاوێکی پیریان هێنا کە لە چاککردنەوەی کەشتیەکان شارەزا بوو هەر لەکاتی گەنجیەوە ئەم کارەی دەکرد، ئەو پیرەمێردە جانتایەك ئامرازو کەرەسەی لەگەڵ خۆی هەڵگرتبوو کاتێك گەیشتە ئەوێ... دەستبەکار بوو، بزوێنەرەکەی بەوردی لەسەرەوە تا خوارەوە پشکنی دووان لەخاوەنانی کەشتیەکە لە گەڵیدا بوون و چاودێری یان دەکرد بەو هیوایە بوون بزانن ئەو چی دەکات بۆ چاك کردنەوەی بزوێنەرەکە. دوای کۆتایی هاتنی پشکنین، پیرەمێردەکە چوو بۆ لای جانتاکەی و چەکوشێکی بچوکی دەرهێنا و بە هێمنی دای لە بەشێکی بزوێنەرەکە و دەست بەجێ بزوێنەرەکە دەستی بە جوڵە کردەوە و بە وریایی چەکوشەکەی گەڕاندەوە شوێنی خۆی، بزوێنەرەکە چاك بوەوە !!! دوای هەفتەیەك خاوەنانی کەشتیەکە پسولەی چاك کردنەوەی کە شتیەکەیان لە پیرەمێردەکەوە پێ گەیشت کە بریتی بوو لە دە هەزار دۆلار !!!

خاوەنانی کەشتیەکە هاواریان لێ بەرز بوویەوە "ئەو هیچی کردووە "

بۆیە بۆ پیرە مێردەکەیان نووسی : تێ بینی (( تکایە تکایە پسولەکەمان بە درێژی بۆ بنێرە))

پیرەمێردەکەش پسولەکەی بەم شێوەیە نارد :

لێدان بە چەکوش.................................. ٢ $

زانینی ئەوەی کە لەکوێی دەدەی.......................... ٩٩٩٨٠٠$

پەندو عیبرەت: تێ کۆشان گرنگە، بەڵام زانینی ئەوەی هەوڵ و ماندووبوون لەکوێ خەرج دەکەیت لە ژیانتدا، شتێکی جیاوازە !!!!.

# درەختە دوورەکە



پیاوێك ڕۆیشت بۆ ماڵی هاوڕێ یەکی بەڵام لەماڵ نەبوو، لەپاشان بە دوایدا گەڕا تاکو دۆزیەوە لە ژێر درەختێکدا دانیشتبوو لە دەرەوەی شار، پێی گوت : نیازم وابوو بەسەفەربچم، با ئەو پارەیە لای تۆ بێت تاوەکو دەگەڕێمەوە، دوای ماوەیەك پیاوەکە لەسەفەرەکەی گەڕایەوە، و چوو بۆ لای هاوڕێ کەی و داوای پارەکەی کردەوە،، ئەویش نەی دایەوە، پیاوەکە چوو بۆ لای قازی و سکاڵای کرد. قازی بانگی هاوڕێ کەی کرد و لێی پرسی : بۆچی پارەی ئەو پیاوە نادەیتەوە، ئەویش گوتی : هیچ پارەی ئەوم لانیە و گوتی ئەو درەختە هەرنازانم لە کوێ یە.

قازی بیری کردەوە، ئینجا بە سکاڵاکارەکەی گوت : ئێستا کە بڕۆ بۆ لای ئەو درەختە، لەوانەیە ئەو پارەیەت لە ژێر درەختەکە شاردبێتەوە، هاوڕێکەت لە تەنیشتمەوە دادەنیشێت تاوەکو دەگەڕێتەوە.

قازی دەستی کرد بە سەیرکردنی مەسەلەکانی تر، لە پڕ قازی تەماشای ڕکابەرەکەی کرد

کە لە تەنیشتیەوە دانیشتبوو پرسیاری لێ کرد : ئاخۆ دەبێ هاوڕێ کەت گەیشتبێتە لای ئەو درەختە ؟

ڕکابەرەکەش گوتی : نەخێر ئەو شوێنە زۆر دوورە.

ئەو کاتە قازی گوتی : کەواتە تۆ شوێنی دارەختەکە دەزانی، و بێ گومان پارەکەی ئەوت زەوت کردووە.. پیاوەکە دانی پێدانا، بۆیە قازی فەرمانی کرد بە پیاوەکە پارەی خاوەنەکەی بداتەوە، و لەسەر ئەو ناپاکیەش سزای دا.

# خاتونێك بەسەرهاتی خۆی دەگێڕێتەوە

من مێردم هەبوو لەگەڵیدا زۆر یەکترمان خۆش دەویست بەڵام خوای گەورە منداڵی پێ نەبەخشین هەرئەوەش بووە هۆی لێڵ بوونی گەردی ژیانمان منیش بەزەییم پێداهاتەوە و پێشنیاری ئەوەم بۆی کرد ژنێکی تر بخوازێت، بەڵام ئەو بەتوندی ڕەتی کردەوە بەڵام من چەندین ڕۆژو مانگ سور بوم لەسەر داواکەم تاکو ڕازیم کرد و لەگەڵیدا ڕوومان کردە خانمێك و دواتر



مارەکراو هاوسەرگیری یەکە تەواو بوو. بەڵام زۆری نەخایاند ئاگری پەرۆش (غیرە) لە دڵمدا هەڵایسا کاتێك بینیم ئەوی لەمن زیاتر خۆش دەوێ لەمن و بەتایبەتیش کاتێك سك پڕ بوو منداڵی بوو لێ ی منداڵێکی جوان. هەرکاتێ پیاوەکەم لێ ی نزیك دەبوویەوە من زیاتر پەرۆشی و ڕق دای دەگرتم تاکو ئەو ڕۆوژەی پێ ی گوتم لەگەڵ ژنە تازەکەی بەنیازە سەفەر بکات و منداڵەکەی لای ئەو بەجێ دەهێڵێ، منیش بەبێ سێ و دوو ڕازی بووم لەبەرئەوەی کەس نیە لە من زیاتر گرینگی بەو منداڵە بدات. لە ڕۆژی یەکەمی سەفەرەکە منداڵەکە لەبەردەمم یاری دەکرد ئەو شەوە شەوێکی زۆر ساردی زستان بوو، بۆیە هەندێك دارم سوتاند تاکو ژوورەکە گەرم بێ - کاتێك منداڵەکە خەریکی یاری کردن بوو، ئاگری ناو دڵم پەرۆشی و ڕقی دەخوارد، منداڵەکە چوو بۆلای سۆپاکەو پشکۆکانی گرتە دەست بەپەلە چوومە لای، بەڵام لە جیاتی ئەوەی پشکۆکان لەدەستی دووربخەمەوە خستمە ناویەوەو تا دەستی توایەوە لەناو ئاگرەکە ئینجا ئاگری دڵم دامرکایەوە بەڵام بەتەواوی نەکوژایەوە.

دوای ئەوە بە کاتژمێرێك هەواڵێکم بۆ هات کە مێردەکەم و ژنی دووەمی دووچاری ڕووداوێك هاتوون و هەدووکیان مردوون، بۆیە خۆم بەتەنیایی مامەوە کەسی ترم نیە بێجگە لەو منداڵە دەست شێوێندراوە. منداڵەکە گەورەبوو خۆشم ویست و خۆشی ویستم ئەو بوو

بە بەرپرسیاری من، هەر ئەو سەرپەرشتیم دەکات و داخوازیەکانم جێ بەجێ دەکات و زۆر بەئەرموو نیانی و سۆزەوە مامەڵەم لەگەڵ دەکات. هەروەها بانگم دەکات بە دایەو خواناسانە لەگەڵم هەڵسوکەوت دەکات، هەرجارەی بە دایە بانگم دەکات دڵم لە خەفەتا ئە گوشرێ و هەرجارەی دەبینم دەستەکانی شێوێندراوە جەرگم بۆی دەسوتێ و بە کوڵ دەگریم و نازانم بێ ئەو منداڵە حاڵم چۆن دەبێ..

﴿ وَعَسَىٰ أَنْ تُحِبُّوا شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَكُمْ ۗ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴾

واتە : لەوانەیشە لەشتێك حەزنەکەن و ناخۆش بێت لاتان، بەڵام خێروچاکەی تێدا بێت و بەخێریش گەڕێ رەنگە حەزتان لەهەندێ شت بێ و پێیشتان خۆش بێت کەچی شەڕو خراپ بێت و ئاکامەکەی باش نەبێ" مرۆڤ بە سروشت هەر دانیشتنی پێ خۆشە، بەڵام دانیشتن وخۆدزینەوە لەجیهاد ڕیسوایی و ژێردەستەیی بەدواوەیە

# بازرگان و کوڕە گەنجەکە



کوڕێـك هـەبوو لەگـەڵ بـاوکی دا دانیـشتبوو، لــه پــڕ پیاوێــك هاتــه ژوورەوە و باوکەکــەی گــرت و بــه توندی ڕای وەشاند و هەڕەشەی لـیٚ کردو لیٚ ی پرسی : کوا پارەکەم ؟؟ ئەی دز لەسەر تۆ زۆر ئـارامم گـرت ؟؟.. کوڕەکە لەترسی مامەڵـەی ئـەو پیاوە لەگەڵ باوکی هەستایە سـەرپیٚ و ووردە ووردە لەمەترســی ئــەوپیاوە هێوربویــەوەو بەپیاوەکــەی گــوت : وازلە بـاوکم بهێنـەو ئـازاری مـەدەو لەگەڵ منـدا قــسه بکـەو ان شـاءالله پارەکەت دەســت دەکەوێتـەوە تـەنها دەست لە باوکم هـەڵگرە و ئـازاری مەدە، پیاوەکە وازی لە باوکی هێنـاو بە کوڕەکەی گوت باوکت ٣٠ هەزاردیناری لـیٚ وەرگرتـووم و هـەر ئێـستا دەمەوێتـەوە، کوڕەکە چۆ ژوورەکەی خۆیەوە و هەرچیەکی کۆکردبۆوە تاکو هاوسەرگیری پێبکات لەو مووچەیەی وەری دەگرێت، ئەو بڕەی پاشەکەوتی کردبوو دەگەیشتە هەزار دینـار، بەرامبـەر باوکی خۆنەویستی نواندو هەموو پارەکەی دا بەو پیاوەو پێی گوت ئەمە سەرەتایەو لـەماوەی دووڕۆژی تر ئەمەکەی تریشت بۆ چارەسەر دەکەم. پیاوەکە لـە قـسەی کوڕەکـە دڵنیـابوو چووە دەرەوە، لە ڕۆژی دواتر پیاوێك پەیوەندی بەکوڕەکە و پیٚ ی گوت : کارمەنـدێکمان پێویستە بەکریٚ ئیشمان بۆ بکات داوای چەند شـتێك کـراوە هـەموویان لـە تۆدایـە، بۆیـە

لەگەڵمدا وەرە بۆئەوەی چاوت بە بازرگانەکە بکەویت و لەگەڵی دا رێك بکەون. کورەکە چوو بۆلای بازرگانەکە و بازرگانەکە لێی پرسی لەکارەکەت موچەی چەند وەردەگریت کورەکە پێی گوت ۹۰۰دینار، ئەویش پێی گوت دەمەوێ لەلای من کار بکەی من موچەی ۱۵۰۰دینارت پێ دەدەم لەمانگێکدا سەرەڕای کرێی نیشتەجێ بوون، وەئەگەر رازیش بووی لە ئێستاوە موچەی ٦مانگت پێ دەدەم پێش ئەوەی بێیتە سەرکارەکەت.

کورەکە خۆی پێ نەگیراو دانیشت دەستی کرد بە گریان، بازرگانەکە لێ ی پرسی : بۆچی دەگری ؟ کورەکەش بەسەرهاتی ئەو پیاوەی بۆ گێرایەوە کەهاتۆتە سەرباوکی و چۆن ئەو لەخوا ترساوەو خوای گەورەش رۆزی بۆ دابین کردوە کەئەو بەخەیاڵی دا نایەت. **وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَلْ لَهُ مَخْرَجًا ﴿٢﴾ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ ۚ وَمَنْ يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ ۚ**.

واتە : هەرکەسێك لە خوا بترسێ و سنوورەکانی بپارێزێ، خوا دەرووی خێری لێ ئەکاتەوە، لە شوێنێکەوە رزق و رۆزی پێ دەبەخشێت کە حسابی بۆ نەکردبێت و خۆی پێی نازانێت ئەو زاتەی بەسە، بۆ ئەوەی یاریدەدەری بێت

## بەڕاستی ئەوە درۆیە



پاشایەك لە وڵاتەکەی ڕای گەیاند هەر کەسێك درۆیەك هەڵبەستێ یان دروستی بکات وام لێ بکات بڵێم نا ئەوە درۆیە ئەوا نیوەیماڵەکەمی دەدەمێ، شوانێك هات بۆ لای و گوتی باوکم گۆچانێکی درێژی هەبوو دەگەیشتە ئاسمان و ئەستێرەکانی پێ دەجوڵاند، پاشاکە پێی گوت: بێگومان ئەوە شتێکی نامۆیە بەڵام ڕوودەدات، باپیرم سەبیلە (دارجگەرە) یەکی هەبوو ڕاستەو خۆ بەگەرمی خۆر دای دەگیرساند، شوانەکە ڕۆیشت بێئەوەی هیچی دەست بکەوێ. یەکێکی تر هات بۆلای پاشاو گوتی : بمبەخشە پاشا دواکەوتم چونکە سەرقاڵ بووم دوێنێ گەردەلولێك هات هەورە بروسك ئاسمانی لەت کرد منیش چوم چاکی بکەمەوە، پاشاکە پێی گوت کارێکی باشت کردووە بەڵام چاك نەت دوریوەتەوە ئەمڕۆ بەیانی هەندێ نەرمە باران باری، ئەویش ڕۆیشت بێئەوەی هیچ وەربگرێت. ئینجا پیاوێکی تر هات بەرمیلێکی لەسەر شان بوو پاشا لێی پرسی بەسەرهاتی تۆ لەگەڵ ئەم بەرمیلەدا چیە ؟ ئەویش گوتی هاتووم ئەوبەرمیلە زێڕەم بدەیتەوە کە پێم دابووی !!! پاشا بە توڕەییەوە گوتی : من قەرزارتم بەیەك بەرمیل زێڕ ؟ پیاوەکە وەڵامی دایەوە و گوتی : بەڵێ. پاشاکە گوتی : نا ئەوە درۆیە، پیاوەکە گوتی : ئەگەر بەڕاستی ئەوە درۆیە ئەوا نیوەی ماڵەکەتم بدەرێ، پاشا بەخێرایی وەڵامی دایەوە و گوتی : نا نا ئەوە ڕاستە. پیاوەکە پێی گوت : ئەگەر ئەوە ڕاستە ئەوا بەرمیلێك زێڕم بدەرێ.... بەڕاستی ئەوەیە زیرەکی بەڕێزان.

# منداڵ بەخششی خوایە



ژنێــك هــەوڵی دەدا خۆی لە کۆرپەلەکەی رزگار بکات بەڵام بـوو بە دەردەسەری، ژنەکـە بە دکتۆرەکەی گوت : ئایــــا دەتـــــوانی نەشتەرگەریم بۆ بکـەی بـــۆ لــــەبار بردنــــی کۆرپەلەکــــــەم و رزگاربونم لـیّ ی ؟ لـە تۆرینگەیەکی ژنانە یەکێك لە خاتوونەکان چووە بەردەم پزیشکی ئافرەتان و بەبێزاریـەوە پـیّ ی گوت : من پێویـستم بـە یارمـەتی تۆیـە، منـداڵی یەکـەمم ئێـستا سـاڵی یەکـەمی تـەواو نەکردووە، و منیش دووگیانم بە منداڵی دووەم، و ناتوانم بەرپرسیارێتی دوو منـداڵی بـچوك هەڵبگرم سەرەڕای بەرپرسیارێتی یەکانی تریشم، بۆیە دەتوانی یارمەتیم بدەی ؟؟

پزیشکەکە وەڵامی دایەوە و گوتی : ئەوە چۆن دەکرێت ؟؟

دایکەکە لە وەڵامدا گوتی : ئایا دەتوانی نەشـتەرگەری لـەباربردنی کۆرپەکـەم بـۆ ئـەنجام بدەی بۆ رزگار بوونم لیّ ی ؟؟!! پزیشکەکە ماوەیەك بیّ دەنگ بوو ئینجا گوتی : بەڵام ئەو کارە ژیانت دەخاتە مەترسی یەوە، رات چیە بە رێگە چارەیەکی گونجاو تر و سەلامەت تر ؟

دایکەکە دوای ئەوەی لـەوەڵامی پزیـشکەکە دڵنیـا بـوو بـە دڵ خۆشـیەوە گـوتی : ئـەم رێگەچارەیە کامەیە ؟

پزیشکەکە گوتی : لەبەرئەوەی تۆ ناتوانی بەرپرسیارێتی دوو منـداڵ لەیـەك کاتـدا بگریتـە ئەستۆ بۆیە دەتوانین خۆمان لە منداڵی یەکـەم دەربـاز بکـەین و کۆرپەلەکـەش بهێڵێنـەوە و

بەممش تۆ خۆت دووچاری نەشتەرگەری ناکەیت و دەبیتە دایکی تەنها یەك منداڵ !!

دایکەکە بەترسەوە وەڵامی دایەوە : ئەستەمە، تۆ دەڵێ ی چی، ئەمە تاوانە. ئایا تـۆ دەزانـی باسی کورەکەم دەکەی ؟

پزیشکەکە بە هێمنی یەوە گوتی : پێم وابوو ئەم رێگە چارەیە باشترە چـونکە هـەردووکیان منداڵی تۆن و هـیچ جیـاوازی یـەك نـی یـە لـە نێـوان کوشـتنی منـداڵێکی شـیرە خـۆرەو کۆرپەلەیەك کە جاریَ رووناکی جیهانی نەبینیوە لەهەردووبارەکەدا یە کێکیانت دەمریَ...

دایکەکە بەسەری خۆی داداو لە نیازو مەبەستی پزیشکەکە گەیشت و نۆرینگەکەی بـەجیَ هێشت دوای ئەوەی وادەی سەردانی مانگانەی تۆمارکرد...

منداڵ بەخششی خوایە تەنها ئەوانە نرخی دەزانن کە بیَ بەش بـوون لـەم بەخشـشـە، ئـەی خوای بەخشندە وەچەی باش و رەسەن ببەخشە بەسەرجەم ئافرەتانی مسوڵمان.

# پارەکەت لەکوێ شاردۆتەوە ؟؟؟

دەگێڕنەوە شەوێك پیاوێ هات بۆ لای پێشەوا ئەبو حەنیفە و پێ ی گوت : ئەی پێشەوا ! ماوەیەکی درێژە هەندێ پارەم لە شوێنێك داناوە، بەڵام ئەو شوێنەم بیر چۆتەوە، ئاخۆ دەتوانی هاوکاریم بکەی لە چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە ؟



پێشەوا پێ ی گوت : ئەمە کاری پێشەوایانی ئاینی نی یە تاوەکو ڕێگە چارەیەکت بۆ بدۆزمەوە، ئینجا کەمێك بیری کردەوە و پێ ی گوت : بڕۆ، تاکو بەیانی نوێژ بکە، ئەو کات شوێنی پارەکەت بیردەکەوێتەوە ئەگەر خوای گەورە ویستی لەسەر بێت ...

پیاوەکە ڕۆیشت و دەستی بە نوێژ کردن کرد، و لە پڕتاو پاش ماوەیەکی کورت، و لەکاتی نوێژەکە، شوێنەکەی بیرکەوتەوە کە پارەکانی تێدا شاردۆتەوە بەپەلە ڕۆیشت بۆ ئەو شوێنەو پارەکەی هەڵگرتەوە.

لەبەرە بەیانی دا پیاوەکە چووە لای پێشەوا ابو حنیفە و، هەواڵی دایە کەپارەکەی دەستکەوتۆتەوەو، سوپاسی پێشەوای کرد.

ئینجا لێ ی پرسی : چۆن زانیت کەمن شوێنی پارەکەم بیردەکەوێتەوە ؟

پێشەوا گوتی : چونکە من دەم زانی کە شەیتان لێت ناگەڕێ نوێژبکەی، و سەرقاڵت دەکات بە بیر کەوتنەوەی پارەکە بۆ ئەوەی واز لە نوێژکردن بهێنی.

## نابینا



شەوێك پیاوێکی نابینا چرایەك بەدەستیەوە دەگرێت و گۆزەیەك دەخاتە سەرشانی و بەرێگادا دەڕوات، لەڕێگادا توشی کەسێك دەبێت پێ ی دەڵێت : برا دەر شەو و ڕۆژ بۆ تۆ وەك یەك وایە، ئەی ئەو چرایەت بۆچی بەدەستەوە گرتووە؟ پیاوە کوێرەکە بە پێکەنەوە ووتی : ئەو چرایە بۆ تۆیە نەوەك چاوت نەبینێ و گۆزەکەم لێ بشکێنیت........!!

# نامەی باوکێك بۆ کوڕەکەی لەزیندان



جوتیارێکی پیر نامەیەك بۆ کوڕە زیندانی کراوەکەی دەنوسێت و دەڵێت : کوڕەکەم ئەمساڵ توانای ئەوەم نابێت پەتاتە بچێنم چونکە توانای زەوی کێلانم نی یە ؟ دەزانم ئەگەر تۆ لێرە بویتایە دەتوانی یارمەتیم بدەیت .

کوڕەکە وەڵامی نامەکەی باوکی دایەوە و بۆی نووسی: باوکە گیان بە هیچ شێوەیەك بیر لە گێلانی زەویەکە مەکەوە چونکە دەمانچەکەم لەناو زەویە کەدا شاردۆتەوە؟

پۆلیس نامەکە دە خوێنێتەوە، رۆژی دواتر هەموو زەوی یەکە هەڵدەکەنن تاوەکو دەمانچەکە بدۆزنەوە، بەڵام هیچین نە دۆزی یەوە.

رۆژی دواتر دووبارە نامەیەکی بۆ باوکی نووسیەوە: باوکە گیان ئێستا پەتاتەکانت بچێنە، ئەوە باشترین کارێکە کە توانیێتم بۆتی بکەم لێرەدا..!!

# پیرەمێر و داڵاشە بچووکەکە



لەکاتێکدا پیاوێکی بەسەڵاچوو لە باخێکی گشتی دا پیاسەی دەکرد ... جوانی دەورووبەری لە درەختەبەرزەکان سەرنجی ڕاکێشا، لە ناکاو چاوی بەهێلانەیەك کەوت کەوادیار بوو بەهۆی باوە لەسەر یەکێك لە درەختەکان کەوتبووە خوارەوە، ئەویش لێی نزیك بووەوە بینی بچکە داڵاشێکی لەناودایە... بۆیە پیاوەکە بڕیاریدا ڕزگاری بکات ..

پیاوەکە دەستی درێژکرد بۆ داڵاشەکە بەڵام ئەو بە توندی گازی لێ گرت...لەبەرتووندی ئازارەکە پیاوەکە دەستی کێشایەوە و هاواری لێ بەرزبووەوە، بەڵام خولەکێکی نەبرد سەرلەنوێ پیاوەکە دەستی درێژکردەوە بۆ ئەوەی ڕزگاری بکات ....داڵاشەکە جارێکی تر گازی لێ گرتەوە....

دوای خولەکێك بۆ جاری سێیەمیش هەوڵی دا بەڵام بێ سوود بوو.

لەنزیك ئەمەوە پیاوێکی تر دانیشتبوو چاودێری ئەم ڕووداوەی دەکرد ؟؟ پیاوەکە هاواری کرد: ئەی پیاوی دانا، بۆچی لەجاری یەکەم پەندت وەرنەگرت ،نە لەجاری دووەم.. ئێستاش لە هەوڵی ئەوەدای بۆ جاری سێیەم ڕزگاری بکەیت ؟

پیرەمێردەکە گوێی بەسەرزەنشت کردنی پیاوەکە نەداو بەردەوام بوو لە هەوڵەکانی تاکوسەرکەوت لە ڕزگارکردنی داڵاشەکە ، لەنێوان گەڵاکانی درەختەکە دایانایەوە... ئینجا بەئاراستەی ئەو پیاوە ڕۆیشت و دەستێکی لە شانیدا و پێی گووت : ئەی کوڕی خۆم ( سروشتی داڵاش وەهایە کە بگەزێت ، سروشتی منیش ئەوەیە کە سۆز و خۆشەویستیم هەبێت ، کەواتە بۆچی دەتەوێ بوار بەسروشتی ئەو بدەم بەسەرسروشتی مندا سەربکەوێت .

پەندو ئامۆژگاری :

مامەڵە لەگەڵ خەڵکی بکە بەسروشتی خۆت نەك بەسروشتی ئەوان ...با ئەوان هەرچیەك بن، ڕەفتاریان هەرجۆرێك بێت ، کە هەندێك جار ئازارت دەدەن و بریندارت دەکەن ، گوێ مەدە بەو دەنگانەی بەرز دەبنەوە و داوات لێ دەکەن واز لە ڕەفتارە باشەکانت بهێنیت لەبەرئەوەی شایانی ئەو ڕەفتارە جوانانەی تۆ نین.

# درەخت و جگەرە



ڕاستی یەکی گرنگ هەیە کە زۆر جار لێمان ون دەبێت ، ئەویش کەڵەکە بوونی کارەکانە بە تێ پەڕبوونی کات.ئەوە بنەمایەکی زۆر بەکەڵکە پێویستە لەبەرچاوبگیرێت، لەوەتەی چەندین ساڵ لەمەوبەر پیاوێك کۆچی دوایی کردەوە کە بە درێژیی چەندەها ساڵ کاری دەکرد لە ( نجاد ) (نسکۆتلندا)، ئەو ڕۆژانە بە هاتن و چوون چەند میلێکی بە پێ دەبڕی بۆ سەرکارەکەی لەوەتەی گەنجێکی هەرزەکار بووە، خوی گرتووە بە گرنگی دان بەدار و درەختەوە ،دەستی کردوە بە کۆکردنەوەی دانەوێڵە و چاندوویەتی ، هەر ڕۆژێك درەختێکی ڕواندووە لە ڕێگای چوونە سەرکاری .

کاتێك ئەو پیاوە مرد دارستانێکی گەورەی لە دارو درەخت چاندبوو.

منداڵێکی بچووك دەستی بە جگەرە کێشان کرد، کاتێك هاوڕێکانی یەکەمین جگەرەیان پێشکەش کرد لە پشت شوێنی وەستانی پاسکیلەکان لە قوتابخانە . جگەرەکە هەستێکی وای بۆ دروست کرد کەتەواو پێ گەیشتووە، هەرچەندە لەسەرەتادا سەرسام نەبوو بەتامەکەی،

بەڵام کەم کەمە لەسەری ڕاهات، بەم شێوەیە لەگەڵ هاوڕێکانی تێکڕای جگەرە کێشانەکەی زیادی کرد لە جگەرەیەکەوە بۆ چەند جگەرەیەك لــە ڕۆژێکـدا . دوای ســاڵێك پاکـەتێکی تەواوی دەکێشا لە ڕۆژێکدا، ئینجا دوو پاکەت جگەرەی دەکێشا، دووچاری توشــبوون بـە شێرپەنجەی سیەکان هاتبوو ، ئەمە چۆن ڕوویدا ؟؟

هەر جۆرە ڕەفتارێك لە ڕێگای دووبارەکردنەوەی کارێك یـان زنجیرەکـارێکی دیـاریکراو چالاك دەبێت، ڕەنگە چەند سەد جار یان چەند هەزارجارێك . بێگومان هەرگۆڕنکاریەك لـە جۆر لەوانەیە ببێتە جۆرێك یان خوویەك لە خودی خۆیدا بەمەرجێك دووبارەببێتەوە.ئـەوەی ڕۆژانە یەك جار دووبارەی دەکەینەوە لەماوەی چەند ڕۆژێکدا دەبێتە خوو.

دەتوانرێت خوونەریتی باش دروست بکرێت لە میانی ئەنجام دانی یەکجار لە ڕۆژێکـدا بـە درێژایی چەند ڕۆژێك .

# قوربانیدان و دڵسۆزی



کچێکی نابینا هەبوو ، ڕقی لە خۆی دەبووەوە چونکە کوێر بوو ، ڕقی لە هەموو کەسێك دەبووەوە لەودونیایەدا، تەنها دۆستێکی خۆشەویستی نەبێ، ئەو هەمیشە لەنزیکی یەوە بووە.

کچەکە بە دۆستەکەی ووت: ئەگەر تەنها بتوانم جیهان ببینم ، شووت پێ دەکەم.

ڕۆژێکیان کەسێك دووچاوی بە کچەکە بەخشی، کاتێك کچەکە چاوی کرایەوە، توانی هەموو شتێك ببینی، لەوانەش خۆشەویستەکەی، لێ ی پرسی : ( ئێستا لەبەرئەوەی دەتوانی جیهان ببینی ، ئایا شووم پێ دەکەی ) ؟

کچەکە سەیرێکی دۆستەکەی کرد،سەرسام بوو کەبینی ئەو نابینایە، پێڵوی چاوەکانی داخراوە، ئەو پێشبینی ئەوەی نەدەکرد، بیری کردەوە ئەو تەمەنەی ماوەیەتی لە ژیاندا لەگەڵ ئەو ئەو بەسەری بەرێت ؟؟؟ ئەمە وای لێ کرد هاوسەرگیری لەگەڵیدا ڕەت بکاتەوە.

کوڕەکە بەگریانەوە وازی لێهێناو دوای چەند ڕۆژێك سەرنجێکی بۆ نووسی : ( تکایە زۆر ئاگاداری چاوەکانت بە خۆشەویستەکەم ، چونکە ئەوە پێشتر چاوی من بوون ).

ئاوەها مێشکی مرۆڤ کاردەکات لە زۆربەی کات ، کاتێك پایەمان دەگۆڕێ، تەنها کەمێکی دەگمەن نەبێ بیر لە ژیانی پێشتر ناکاتەوە، چۆن هەمیشە لەلایانەوە بووین لە دۆخە زۆر بەئازارەکان.

لە مرۆوە ، بەرلەوەی دەست بکەیتەوە و شتێکی ناجوان بڵێ ی ، بیر لەوانەبکەوە

كەناتوانن قسەبكەن ، بەرلەوەی ڕەخنە لەو خواردنە بگریت كە چێژی لێ دەبینی، بیر لەو كەسانە بكەوە كە هیچیان نی یە بۆ خواردن !!!

بەرلەوەی ڕەخنە لە هاوسەرەكەت بگریت ، بیر لەو كەسە بكەوە كە لەبەر خودا دەپاڕێتەوە و دە كرووزێتەوە هاوسەرێكی دەست كەوێ !!!

پێش ئەوەی سكالا لە ژیان بكەی، بیربكەوە لەو كەسەی پێش تۆ زوو دەستی بەرەو ئاسمان هەڵبڕیوە!!! بەرلەوەی بێزاری خۆت دەربڕی لە درێژی ئەو ماوەیەی بە سواری ئۆتۆمبێلەكەت دەیبڕی، بیرلەوانە بكەوە كە هەمان ماوە بە پێ ڕۆیشتن دەبڕن !!! كاتێك ماندودەبیت و لەكارەكەت بێزار دەبیت ، بیربكەوە لەو كەسەی وەكو تۆ كاری نیە كە تۆ هەتە و بێكار دانیشتووە!!

تاكو ئێستا زیندووی و سوپاسی خوابكە لەسەر ناز و نیعمەتەكانی ،كاتێك بیرۆكەكانت دەست دەكەن بە دارمانت ، خەندەیەك بخەسەر لێوەكانت و بیربكەوە كە تۆ

## لە سێ خولەکدا چی دەکەی ؟




باوکم خاوەنی کارگەیەکی دروستکردنی زێڕ بوو. ئەو بەرادەیەك چرووك بوو کە قوماشێکی سپی لەسەر زەوی یەکە ڕادەخست بۆ ئەوەی تۆزی ئەو زێڕەی بەبا دەڕوات بکەوێتە سەری ... لە کۆتایی هەفتەدا هەردوو پێ ی بە ئاو تەڕدەکرد و ئینجا بەسەر قوماشەکەدا دەهات و دە چوو تاوەکو ئەو تۆزو گەردە ئاڵتونانە بە پێ یەکانی کۆبکاتەوە. بەم شێوازە چەند گرامێك زیاتر ئاڵتونی دەست دەکەوت ، ئەو پێ ی وابوو ئەم جوڵەیە لە نهێنی پیشەکەیەتی !!...بیرم نایەتەوە کە کێ ئەم چیرۆکەی گێڕاوەتەوە ، بەڵام وانەیەکی گرنگی فێرکردم لەوەتەی چەندین ساڵ لەمەوبەرەوە، لە ژیانماندا چەندین خولەك بە فیڕۆ دەڕوات کەلەو تۆزە ئاڵتونە بەبا ڕۆیشتوانە بەنرخترن، هەموومان سکاڵای کەمی کات دەکەین وێڕای زۆری سەرقاڵی، بەڵام ئەگەر زۆریش سەرقاڵ بین ( کە زۆربەی خەڵك زیادە ڕۆیی تێدادەکەن ) ئێمە لە ڕۆژێکدا زیاتر لە دوو کاتژمێر کات بە فیڕۆ دەدەین کە سەرجەمی خولەکە پەرش و بڵاوەکانە ...لەکاتی وەستانت لە ترافیك لایت ...لە کاتی چوونت بۆلای دوکاندار ...لەمیانەی چاوەڕێ کردنت لە نۆرەگرتن ....لە میانی بونت لە

گەرماو، کاتێکی بەنرخت لەدەست دەچێت کەدەتوانیٚ سوودی لیٚ وەربگیریٚ بەکەمێك لە شارەزایی و پلان دارِشتن...!!

ئایا دەتوانن پێم بڵێن لەماوەی سیٚ خولەك چی دەکەن ؟؟؟

# مەدالیای گوێ درێژ




لە میانی پێشوازی کردن لە ( غلیۆمی دووهەم ) ئیمپڕاتۆری ئەڵمانیا لە ساڵی ١٨٩٨ ز لە دیمەشق ، خانمی ئیمپڕاتۆر کەریکی سپی سەرنجی ڕاکێشا ، داوای لە والی کرد بۆی بێنێ ، بۆ ئەوەی وەکو یادەوەریەك لەگەڵ خۆی بیبات ، والی بە شوێن خاوەنەکەید گەڕا ، زانی کەھی ( ئەبالخیر ئاغایە ) ، ئەویش لە پیاو ماقوڵانی شارەکەیەتی ، هەمیشە شانازی بەوە دەکات کە دوو خۆشەویستی هەیە : گوێ درێژەکەی و حوسنی نەوەکەی !! والی بانگی ( ئەبالخیر) ی کرد، داوای لێ کرد گوێ درێژەکەی بەدیاری بدات بە خانمی ئیمپڕاتۆر ، ئەویش داوای پۆزشی کرد ، والیش داوای لێ کرد بیفرۆشێ ، بەڵام ئەو ڕەتی کردەوە ، کاتێك والی سوور بوو لەسەرداواکەی ، ( ئەباالخیر ) وەڵامی دایەوە : ئەی ئەفەندی من شەش ئەسپی نایابم هەیە ، ئەگەر دەتەوێ هەموویان دەکەمە دیاری بۆ خانمی ئیمپڕاتۆر، بەڵام گوێ درێژەکە نا !! والی بەم وەڵامە زۆر سەرسام بوو ، پرسی : بۆچی ؟ گوتی : گەورەم

ئەگەر گوێ درێژەکە ببەنە وڵاتی خۆیان ئەوا هەرچی ڕۆژنامەی دونیایە لەسەری دەنووسن، ئەو گوێ درێژە شامی یە دەبێتە مایەی پێکەنین و گاڵتەجاڕی،ئەوسا خەڵك دەڵێن : ئیمپراتۆری ئەڵمانیا هیچی لە دیمەشق بەدی نەکرد سەرنجی ڕابکێشێ بێجگە لە گوێ درێژەکە، بۆیە من پێشکەشی ناکەم ! و ناشی فرۆشم !!

والی هەواڵەکەی گەیاندە ئیمپراتۆر و ژنەکەی، ئەوانیش دایانە قاقای پێکەنین، بەم وەڵامە زۆر سەرسام بوون ، ئیمپراتۆر فەرمانی دەرکرد مەدالیایەك ببەخشن بە (ئەباخیر ) و ناویان نا ( مەدالیای گوێ درێژ ).

# نانی دایكم ....و.......قاوەی دایكم



كاتێ لە زیندان بووم دایكم سەردانی دەكردم و میوە و قاوەی بۆ دەهێنام .ئەو ڕۆژەم بیر ناچێت كە پاسەوانی زیندانەكە دۆلكەی قاوەكەی لێ ستاند و ڕژاندیە سەر زەوی وئەویش زۆر دڵ تەنگ بوو، فرمێسكەكانیم بیر ناچێتەوە. بۆیە دان پێدانانێكی تایبەتیم بۆ نووسی لە زیندانەكەم، لەسەرپاكەتی جگەرە، تیایدا دەڵێم : یادی نانی دایكم ...و قاوەی دایكم دەكەم... دەست لێدانی دایكم ...مندالی تیامدا گەورە بوو ...ڕۆژێك لەسەرسنگی دایكم ...ئەشقی تەمەنم بوو چونكە ...ئەگەر مردم ...لە فرمێسكی دایكم شەرمەزاردەبم . پێم وابوو ئەمە پۆزشێكی تایبەتیە لە منداڵێكەوە بۆ دایكی ،من نەم دەزانی ئەم قسانە دەبنە گۆرانی و ملیۆنەها منداڵ دووبارەی دەكەنەوە.

# نەبوونی قەناعەت



لــە پەنـد و چـیرۆکەکانی چـینی دێـرین داهـاتووە کـە پادشـایەك دەیـەوێ یـەکێك لــە هاونیشیتمانیانی خەڵات بکات بۆیە پێ ی گووت: ئەوەندەی دەتوانی لە خـاکی سـەرزەوی بەڕۆیشتن بەپێ بیری دەبێتەماڵی تۆ، پیاوەکە زۆر دڵشاد بوو بەم قسەیە و بە پەلە دەڕۆیشت و بە شێتانە ڕای دەکرد بۆ ئەوەی ڕووبەرێکی فراوان ببڕێت ، بیری کردەوە بگەڕێتـەوە لای پاشا تاوەکو ئەو ڕووبەرەی بڕیویەتی پێ ی ببەخشێ، ماوەیەکی درێژی بڕی و مانـدوو بـوو، بەڵام ڕاکەی گۆڕی و بڕیاریدا بەردەوام بێت لەسە ڕۆیـشتن تـاوەکو زیـاتری دەسـکەوێت ،بیری کردەوە بگەڕێتەوە لای پاشا و چیدی نـەڕوات ، بـەڵام جـارێکی تـریش دوودڵ بـوو بڕیاریدا درێژە بە ڕۆیشتنەکەی بدات تاوەکو زیاتر و زیاتری دەسکەوێت، بەڵام ئەم جارە بـۆ یەکجاری نەگەڕایـەوە،ڕێگای وون کـرد و ژیـانی لەدەسـت دا، پیاوەکـە هـەر ڕۆیـشت و ڕۆیشت ، دەڵێن ئەوکەسە لەبەرئەوەی زۆر شەکەت و ماندوبوو لە هۆش خۆی چوو بوو . ( نە بووە خاوەنی هیچ و هەستی بە شادی نـەکرد چـونکە نەگەیـشتە ڕادەی ڕازی بـوون و قەناعەت ).

## بەسەرهاتی شێر و ژنەکە



شارۆچکەیەك هەبوو کۆشکێکی تێدابوو، لەناویدا تەنها هۆڵێك هەبوو کە هەزار ئاوێنەی تێدا بوو ، شێرێك بیستی کە هۆڵێکی لەم شێوەیە هەیە بۆیە بڕیاریدا سەردانی بکات، ئینجا ڕۆیشت بۆ ئەم کۆشکە ، کاتێك گەیشت لە خۆشیان لەسەر قادرمەکان بازی دەدا و کاتێ چووە ناو هۆڵەکەوە بینی هەزار شێر بە ڕووی ئەو پێدەکەنن و کلکیان دە جوڵێنن لە خۆشی ئەو ،بەمە زۆر دڵخۆش بوو ، لە دڵی خۆیدا ووتی : بێگومان دەبێ زۆر جاری تر بێم بۆ ئێرە .

شێرێکی تریش ئەم بەسەرهاتەی بیست و بڕیاریدا سەردانی کۆشك بکات وەکو هاوڕێکەی ، بەڵام بە سروشتی خۆی دڵخۆش نەبوو ....بە هەنگاو نانێکی قورس ڕۆیشت تاکو گەیشتە ناو هۆڵەکە هەزار ئاوێنەی تێدابوو...بەڵام زۆر سەری سوڕما...بینی هەزار شێر ڕوویان گرژ کردووە لێ ی ، بۆیە ددانی چرکردەوە و ترسا و ڕووی وەرگێڕا و ڕۆیشت ، ئەو مەبەستی نەبوو هیچ شتێك بکات.

بیرت نەچێت ، هەموو دەم و چاوەکان لە جیهاندا ئاوێنەن هەر ڕەنگدانەوەیەك لەسەر ڕووی خەڵك بەدی بکەیت ئەوە لە دروست کردنی خۆتە ، تۆ وێنەی بنەڕەتی و کاریگەریت بە شێوەیەك لە شێوەکان لەسەر کەسانی تر ڕەنگ دەداتەوە.

## واز لە دەریاچەکە بێنە تاکو ئارام دەبێتەوە



کیژۆڵەیەکی بچووك هەبوو، ڕاهاتبوو لەسەر چوونە دەرەوە بۆ سەر دەریاچەیەکی زۆر بچووك ، سەرنجی لە ڕەنگدانەوەی وێنەی خۆی دەدا لە ناو ئاوی دەریاچەکە چونکە ئارام بوو .

ڕۆژێکیان برا بچوکەکەی لەگەڵ خۆیدا برد ، لە کاتێکدا ئەو سەرنجی ئاوی دەریاچەکەی دەدا و پرچی خۆی شانەدەکرد لەبەرامبەریدا، براکەی بەردێکی هەڵگرتەوە و خستیە ناو دەریاچەکەوە، ئاوەکە شەپۆلی داو وێنەی کچەکە تێك چوو.

کیژۆڵەکە زۆر توڕە بوو دەستی کرد بە هەوڵدان بۆ وەستاندنی شەپۆڵەکانی ئاوی دەریاچەکە،لێرەو لەوێ هەرخەریك بوو دەجولاً بۆ وەستاندنی شەپۆڵدانی ئاوەکە بەڵام مەخابن نەیتوانی ، پیاوێکی پیر بەوێدا ڕەت بوو کە ئەم دۆخەی بینی پرسیاری لە کیژۆڵەکە

کرد ، ئەویش چیرۆکەکەی بۆ گێرایەوە، مامە پیرەش گرفتەکەی پێ گووت؟؟

تەنها ڕێگا چارەی ئەم گرفتە کە شەپۆلەکانی ئاوەکە بوەستێنی بەڵام زۆر گرانە ، کیژۆلەکە گووتی : بەهەر نرخێك بێت ئەنجامی دەدەم : پیاوە پیرەکە گووتی:(وازبێنە لە دەریاچەکە تاکو ئارام دەبێتەوە).

پوختەی قسە: هەندێك کێشەو گرفت هەیە کاتێك هەوڵ دەدەین چارەی بکەین ، ڕەنگە خراپتری بکەین...هەرچەندە نیازیشمان پاك و تەواوبێت ،بۆیە پێویستە لەسەرمان ئارام بگرین و وازی لێ بهێنین بۆ کات چونکە کات دەستەبەری چارەی دەکات :وە بە خۆت بڵێ : (وازبێنە لە دەریاچەکە تاکو ئارام دەبێتەوە).

# بەسەرهاتی پاسەکە....و گۆڕان لەژیان



لە بەرەبەیانی ڕۆژی هەینی بەڵێنم دابو بە هاوسەرەکەم کە پێکەوە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت قسە بکەین لەڕێگای بەرنامەی (ماسنجەر هۆتمێل) ئەوەش چونکە من لە وڵاتێکی عەرەبی کاردەکەم و ئەویش لە میسر نیشتەجێیە لەگەڵ کیژە جوانەکەمان (خلود) ، بەهاوکاری خوای گەورە ئەو ڕۆژە زوو هەڵسام بۆ نوێژی بەیانی و لە مزگەوت دانیشتم تاوەکو ویردەکانی بەیانیم تەواو کرد و قورئانم خوێند و گەڕامەوە ماڵەوە وەدەستم کرد بە ئەنجامدانی هەندێ کارونەرک وەکو شتنی جلو بەرگ و ئوتوکردنی جلەکانی دەرەوە ئینجا سەیری هەندێ بەرنامەی بەسوودم کرد لە کەناڵی (الرسالە) و کەناڵی (الناس) و (سمارتس وی) ئینجا نان و چای بەیانیم خوارد و دوای ئەوەش خۆم شوشت خۆشێتنی ڕۆژی هەینی وەکو ئەرێتێکی پێغەمبەری خوا درودی خوای لەسەر بێت ئینجا نوێژی چێشتەنگاوم کرد چوار ڕکات و لە ماڵەوە چوومە دەرەوە لەگەڵ خوێندنی دوعای چوونەدەرەوە لەماڵ هەروەکو خۆشەویست درووودی خوای لەسەر بێت فێری کردوین وە نیازی چوونە دەرەوەم لە ماڵەوە کردە ڕۆیشتن بۆ مزگەوت بۆ ئەوەی هەموو هەنگاوێکم بە چاکەیەک بنوسرێ چونکە وادەی چاوپێکەوتنەکە لەگەڵ هاوسەرەکەم دوای نوێژی هەینی بوو شوێنەکەش دووربو پێویستی بە هۆکارێکی گەیاندن دەکرد ، گەیشتمە وێستگەی پاسەکان (ئوتوبیس) وکاتێ گەیشتم پاسی ژمارە ١٠٥ گەیشتە ئەوێ کە ژمارەکەم کە دەزانی بەڵام نەمدەزانی بەرەو کوێ دەڕوات و پێم وابو بۆ ئەو شوێنە دەڕوات کە من دەمەوێ بۆی بچم بۆیە بە خێرایی سەرکەوتم و بلیتی سواربونم وەرگرت لەسەر کورسیەک دانیشتم و لە گیرفانم قورئانەکەم دەرهێنا کە هاوڕێمە لە گەشت هاتوچوونەکانمدا بۆ خوێندنەوەی قسەی خوا و بیرکردنەوە لێ ی بۆ هەر کوێ یەک بچم تاوەکو کات بە فیڕۆ نەڕوات و لەبەر ئەوەش کە ئەوڕۆژە ڕۆژی هەینی بوو بۆیە گرنگی دان بە سورەتی

(الكهف) بوو بۆ داخوازی نوری هیدایەت لە نێوان هەردوو هەینی و بەکارکردن بە سوننەتی خۆشەویست دووردی خوای لەسەر بێت ،.... بەڵام شتێکی نامۆ ڕووی دا کە بووم دەرکەوت پاسەکە بەڕێگایەکی تردا ڕێ دەکات ئەک ئەو ڕێگایەی پێشبینم کردبوو ، کەمێک دڵتەنگ بوم بەڵام زۆری نەخایەند و بە خۆم گوت خێری تێدایە و بەخێرای دانیشتم بیرم کردەوە ناخۆ بەردەوام بم لە دانیشتن لە ناو پاسەکە تاکو دەگاتە کۆتا مەترل لەو ڕێ یەی پیادا دەڕوات یاخو دابەزم و سواری پاسێکی تر بم کە کە بچی بۆ ئەو شوێنەی مەبەستمە . دەستبەجێ بڕیارم دا لە پاسەکە بێمە خوارەوە ڕووم کردە وێستگەی پاسێکی تر و لەوێ پرسیارم لە یەکێک لە دانیشتوان کرد ڕێنمای کردم بەرەو وێستگەی بەرامبەر و ڕووم کردە ئەو شوێنەی نیشانی دام و لەوێش لە یەکێک لە چاوەڕوانکارانم پرسی ئەویش ژمارەی ئەو پاسەی پێ گوتم ئەگەر سواری ببم نیشانی دام و لەوێش لە یەکێک لە چاوەڕوان کارانم پرسی ئەویش ژمارەی ئەو پاسەی پێ گوتم ئەگەر سواری ببم دەگاتە ئەو جێگایەی دەمەوێ ! دوای چەند ساتێک ئەو پاسە هات کە ژمارەی ٥٩ بوو سواربووم و بەرلەوەی پارەی بلیتەکە بدەم لە شۆفێرەکەم پرسی پاسەکە بە چی ئاڕاستەیەک دەڕوات ئەویش پێ ی گوتم ئێنجا زانیم ئەوە ڕێگای ڕاستە و پارەی بلیتەکەم داو لەسەر کورسی دانیشتم ، هەرکە دانیشتم دەستم کرد بە بیرکردنەوە لە ڕووداوەکانی ڕابردوو ، لێرەوەدا بیرۆکەی نامۆم بە مێشکدا دەهات ئەو ڕووداوەم بەراورد دەکرد بە هێڵی ڕۆیشتنی ژیانم و لە خۆمم پرسی ئەگەر ئەو هەڵە بچوکە لە نەزانینی ئاڕاستەی پاسەکەی سواری بوم کات و پارەی لە کیس دابم ناخۆ بەڕۆیشتنم لە پەیوەندیەکانم لەگەڵ خودا چۆن بێت .... پەیوەندیەکانم لەگەڵ کەس و کار و خەڵکانی تر .. پەیوەندیم بە خێم و ناخۆ من بە ئاڕاستەی دروست ڕێ دەکەم یان ئاڕاستیە هەڵە؟ لێرەوە گوتم بێ گومان دەبێ بوەستم بۆ بیرکردنەوەی نایا بەردەوام بم یان بوەستم و بە خۆم دا بچەمەوە تەماشای دەوروبەرم بکەم و تەماشای هەر شتێک بکەم کە دەمگەیەنێتە ئەو ڕێگایەی لەسەری دەڕۆم ، بۆیە سێ کەڵک و قازانجم لەو هەڵوێستە وەرگرت کە دابەشم کردووە بۆ سێ ڕووداو لە هەر ڕووداوێک قازانجێکم بە دەست هێناوە بەم شێوەیەی خوارەوە:

(( ڕووداوی یەکەم ))

سواری پاس بووم بێ ئەوەی بپرسم لە یەکێک لە دانیشتوان تەنانەت لە شۆفێرەکەش.

سوود و قازانج:
بە تەنها بوونی ئامانج بۆ تۆ بەس نی یە و بەڵکو دەبێ بێگومان بە ڕێگای ڕاست بزانی بۆ گەیشتن بەو ئامانجەت تاوەکو کاتت زۆر بە فیڕۆ نەڕوات و بەبێ سوود قازانج.

(( ڕووداوی دووەم ))
ترس و نیگەرانی دای گرتم کاتێک زانیم پاسەکە بە پێچەوانەی نیازی من دەڕوات و بەڵام بە خێرایی و ئەو نیگەرانی یەم گۆڕی و بیرکردنەوە بۆ چارەسەرکردنی هەڵوێستەکە.
سوودوقازانج:
هەرگیز وامەزانە کە هەڵەکردن کۆتایی جیهانە و بەڵام بڵێ (ڕەنگە خێری تێدابێ) و لە هەنگاوێکی تازە بیربکەرەوە و ڕێگایەکی تربدۆزەرەوە بۆ گەیشتن بە ئامانج.

((ڕووداوی سێ یەم ))
ئەویش بریتی بوو لە خێرای هاتنە خوارەوەم لە پاسەکە پاش ئەوەی بڕیارم دا ڕێڕەوەکەم بگۆڕم ، ئەگەر خێرایی جێ بە جێ کردنەکە نەبوایە ئەگەری ئەوە هەبوو ڕێگەی گەڕانەوەی زۆر دوورودرێژ بوایە یان پاسەکە دەگەیشتە کۆتا وێستگەکەی.
سوودوقازانج:
ڕاوێژ بکە_ بڕیاربدە_ بەزوورترین خێرایی جێ بە جێ بکە چونکە ماوەکە کورت و بەر تەسکە و ئیش و کارەکانیش زۆرن .

# سێ فلتەرەکەی سوقرات



سەرچاوەی هەموو کێشەکان و پچڕانی پەیوەندییەکان و دورکەوتنەوەی نێوان خەڵك تەنها قسە هێنان و بردنە .

هەمیشە ئەو دانایەت لەیاد بێت هەرکاتێك هەوڵت دا قسە بێنی و ببەی پڕوپاگەندە بڵاوبکەیتەوە .

لەیۆنانی کۆن لەنێوان ساڵانی (٣٩٩ - ٤٦٩) پێش زایین ناوبانگی سوقرات بەرز ڕاگیرا بەهۆی ئەو داناییەی کە هەیبوو .

ڕۆژێك لەڕۆژان فەیلەسوفی گەورە (سوقرات) یەکێك لەناسیاوانی خۆی بینی بە پەرۆشەوە بەسوقراتی ووت: ئایا دەزانی چ شتێکم لەیەکێك لەقوتابیەکانت بیست ؟ دوای چەند چرکەیەك وەستان سوقرات وەڵامی دایەوە ، حەزدەکەم پێش ئەوەی هەواڵەکەم پێ بدەیت تاقیکردنەوەیەکی بچوك تێپەڕێنیت ئەویش پێی دەڵێن ((تاقیکردنەوەی سێ فلتەری))

سێ فلتەری

بەڵێ ئەمە ڕاستە

سوقرات بەردەوام بوو ، پێش ئەوەی هەواڵی قوتابیەکەم پێ بدەی با چرکەیەك ئەو

هەواڵەی پێم دەڵێیت لە فلتەری بدەین .

فلتەری یەکەم ڕاست گۆییە

ئایا تۆ دڵنیای ئەو هەواڵەی کە پێم دەڵێیت ڕاستە ؟

پیاوەکە گووتی : نەخێر ، لەڕاستیدا تەنها هەواڵەکەم بیست و ........

سەقرات ووتی : باشە ، ئەگەر تۆ دڵنیانیت ئەو هەواڵەی پێمی دەڵێیت ڕاستە یان هەڵەیە.

با فلتەری دووەم تاقیکەینەوە .

فلتەری دووەم چاکە

ئایا ئەو هەواڵەی دەربارەی قوتابییەکەم پێم دەڵێیت شتێکی چاکە

پیاوەکە گووتی : نەخێر ، بەپێچەوانەوە ......

سوقرات وتی باشە بابەردەوام بین

کەواتە شتێکی خراپ دەربارەی قوتابییەکەم پێ دەڵێیت لەگەڵ ئەوەشدا دڵنیانیت کە ئەو شتە ڕاستە؟

پیاوەکە دەستی کرد بەهەست کردن بە شەرمەزاری

سوقرات بەردەوام بوو ، ئێستاش توانای سەرکەوتنت هەیە لەتاقیکردنەوەکەدا

فلتەری سێیەم (کەڵك و سود)

سوقرات وتی ئایا ئەو هەواڵەی دەربارەی قوتابیەکەم پێم دەڵێیت کەڵك و سودی هەیە

پیاوەکە ووتی : لەڕاستیدا نەخێر

سەقرات بەردەوام بوو ، باشە ئەو هەواڵەی دەربارەی قوتابییەکەم پێم دەڵێیت ڕاست نەبێت و... چاك نەبێت و... کەڵك و سودی نەبێت ، باشە کەواتە بۆچی ئەم هەواڵەم لە بنچینەدا پێ دەڵێیت ؟

خوشك و براکانم باش بزانن کە خودای تاك و تەنیا پێش سوقرات فەرمانی پێکردووین کە شتێك نەهێنین نەبەین تەنها ئەگەر ڕاست و چاك و کەڵك و سوود بەخش نەبێت .

# هاوسەرگیری پێویستی بە ڕەشكەرەوە هەیە....؟؟



كاتێك كوڕە گەنجێك هاوسەرگیری كرد باوكی بۆ پیرۆزبایی كردنی چووەماڵەكە و، كاتێك لای دانیشت داوای لێ كرد پێنووسێك و كاغەزێكی بۆ بهێنێ .

كوڕەكە گوتی: لە كەرەسەی هاوسەرگیری هەموو شتێكم كڕیوە تەنها دەفتەر و پێنووس نەبێ بۆچی بابە گیان؟

باوكی پێ ی گوت: كەواتە برۆ كاغەز و پێنووس و ڕەشكەرەوە بكڕە.

لەگەڵ سەرسامی یەكی زۆر كوڕەكە چوو بۆ بازاڕ و كاغەز و پێنووس و ڕەشكەرەوەی هێنا و لە تەنیشت باوكیەوە دانیشت.

باوكەكە: كوڕەكەم بنووسە.

كوڕەكە: باوكە گیان چی بنووسم؟

باوكەكە: هەرچیەك.. بنووسە

كوڕەكە، ڕستەیەكی نووسی،

باوكەكە پێ ی گوت: بیسڕەوە...

کوڕەکە سڕیەوە

باوکەکە: بنووسە

کوڕەکە: توخوا باوکە چیت دەوێت..؟

باوکەکە پێ ی گوت: بنووسە.

کوڕەکە، نووسی،

باوکەکە پێ ی گوت: بیسڕەوە،

کوڕەکە، سڕیەوە

باوکەکە پێ ی گوت: بنووسە.

کوڕەکە گوتی: بە خوا سوێندت دەدەم بابە گیان پێم بڵێ....ئەمە بۆ چی یە؟

باوکەکە پێ ی گوت : بنووسە

کوڕەکەش نووسی

باوکەکە پێ ی گوت: بیسڕەوە...

کوڕەکە سڕیەوە

ئینجا باوکی سەیری کرد و دای بە شانی دا و گوتی: کوڕەکەم هاوسەرگیری پێویستی بە ڕەشکەرەوە هەیە....ئەگەر لە هاوسەرگیریت ڕەشکەرەوە هەڵنەگریت و، هەندێك لە هەڵوێستەکانی پێ بسڕیتەوە کە حەزیان پێ ناکەیت لە هاوسەرەکەت، هەروەها هاوسەرەکەشت ئەگەر ڕەشکەرەوەیەکی پێ نە بێ بۆ سڕینەوەی هەندێك لەو هەڵوێستانەی حەزیان پێ ناکات لە لای تۆ وە ئەوا لاپەڕەی هاوسەرگیری یتان ڕەش هەڵدەگەڕێ لە چەند ڕۆژێکدا.

خوایەگیان ئەگەر هەر کەسێك بەم تێ ڕوانین و ئەقڵیەتە بیر بکاتەوە ئەوا ژیانی هاوسەرگیری دەبووە بەهەشتی خوای گەورە لە سەر زەوی.

# هاوڕێ ی ڕاستەقینە....؟؟



لە یەکێك لە جەنگەکان سەربازێك بە ئەفسەرەکەی گووت: گەورەم هاوڕێ کەم لە مەیدانی جەنگدا نەگەڕاوەتەوە،داوات لێ دەکەم مۆڵەتم بدەیت بەدوای دابگەڕێم بزانم نای دۆزمەوە.

ئەفسەرەکە گووتی: کەواتە ڕێگات پێ نادەم!!چونکە نامەوێت ژیانت بخەیتە مەترسی یەوە لە پێناوی کەسێکدا کە ڕەنگە نەمابێت و کوژرابێت.

سەربازەکە ڕۆیشت، بێ ئەوەی گرنگی بە ڕێگانەدانی ئەفسەرەکەی بدات، و پاش سەعاتێك بە بریندارى یەکی کوشندەوە گەڕایەوە و تەرمی هاوڕێ یەکەشی بەسەر کۆڵی دا هەڵگرتبوو.

ئەفسەرەکە بە شازی بە خۆکردنەوە بە سەربازەکەی گووت:پێم گووتی هاوڕێ کەت مردووە! باشە پێم بڵێ ئایا برادەرەکەت شایانی ئەو هەموو کارە چاکەیە بوو کە تۆ گیانی خۆتی ئاوەها بۆ بخەیتە مەترسی یەوە؟!

سەربازەکە کەلە گیانەڵادابوو گووتی:بێ گومان گەورەم! کاتێك دۆزی مەوە هێشتا زیندو بوو و توانای قسەکردنی ما بوو و توانی پێم بڵێت : من دڵنیا بووم کە تۆ دێیت هاوڕێ کەم....!!!

## بۆچی ناوی قەلەڕەش لە قورئاندا هاتووە...



بێگومان گیان لەبەرانیش یاساو ڕێسا ی تایبەت بەخۆیان هەیە لە هەڵسوکەوت و گوزەرانی ڕۆژانەیاندا و ، چۆنیەتی هەڵسوکەت کردنیان لەگەڵ یەکتریدا بە شێوەیەکە ئێمەی مرۆڤ بەگشتی لێیان تێناگەین تەنها ئەو کەسانە نەبێت کە کاریان لێکۆڵینەوەیە لەم بوارەدا.

هەربۆیەش تێڕامان و بەدواداچون لە ژیانی گیانداران زیاتر ئاشنامان دەکات بەم جیهانە فراوان و سەر سوڕهێنەر و ئاڵۆزە، کە لە وانە یە جیاوازی وا نەبێت لەگەڵ ژیانی ئێمەی مرۆڤدا ، بەڵکو لە زۆر ڕووەوە ئاڵۆز تر و پێشکەوتوو تریش بێت ، هەر بۆیە سەرنجتان بۆ ئەم بابەتە ڕادەکێشم لەژیانی یەکێك لە گیان لەبەرە کان.

دەوری کاریگەری قەلەڕەش لەو چیرۆکە قورئانیەدا فێرکردنی ئادەمیزادە کەچۆن مردووەکانی بنێژێت، باشە بۆچی خودای پەروەردگاری کاربەجێ لە نێوان هەموو گیان لەبەرانی خۆیداقەلە ڕەشی هەڵبژاردووە؟بۆ ئەوەی بیکات بەیەکەمین مامۆستای ئادەمیزاد!لێکۆڵینەوە زانستیەکان ئەمەیان پشت ڕاست کردۆتەوە کەوا قەلە ڕەش زیرەکترین و فێڵبازترین گیاندارە لە نێو گیانداراندا،هەروەها مێشکیشی گەورەترین قەبارەی هەیە بەبەراورد لە گەڵ قەبارەی لاشەی خۆی لە نێوان باڵندەناسراوەکانی تردا.

هەروەها لە نێو ئەوزانیاریانەی کە لێکۆڵینەوەکان دەریان خستووە دەربارەی ژیانی گیانداران، ئەویش دادگایی قەلەڕەشەکانە، لێرەدا کۆمەڵی قەلەڕەشان هەر تاکێك دادگایی دەکەن کە لە یاسا و ڕێسای دانراوی ئەوان دەربچێت،کە بە پێی یاسای دادگەری سروشتی

کە خودای دادگەر بۆی داناون، هەربۆیە ، بۆ هەر تاوانێك لـە نێـوان کۆمـەڵی قەلەڕەشـان سزای تایبەت بەخۆی هەیە ، لەوانە.

١. تاوانی داگیرکردنی خواردنی بێچوە قەلی بچووك: سزاکەی ئەوەیە کە کۆمەڵێك قەلە ڕەش هەڵدەستن بە پەڕ و باڵ کردنی قەلەڕەشە تاوانبارەکـە تـاوەکو وای لێدەکـەن توانـای فڕینی نەمێنیت ، وەکو بێچووی بچووکی لێدەکەن پێش پەڕو باڵ دەرکردن.

٢. تاوانی دەگیر کرن و تێکدانی هێلانە: دادگای قەلە ڕەشان بەوەن واز لە قەلە ڕەشـە تاوانبارەکە دەهێنن ، کە هەستێت بە دووبارە دوورستکردنەوەی یاخود جێهێشتنی قەلەڕەشە زوڵم لێکراوەکە.

٣. تاوانی دەستدرێژی کردنـە سـەر مێـەی یـەکێکی تـر لـە قەلەڕەشـەکان، دادگـای کردنەکە کۆمەڵی قەلەڕەشان هەڵدەستن بە لێـدانی قەلەڕشـە تاوانبارەکـە بـە دنوکـەکانیان تاوەکو دەیکـوژن. هەمیـشە ئـەو دادگـای کردنـەش لـە کێڵگەیـەکی کـشتوکاڵی یـاخود پارچەزەویەکی فراوان بەڕێوەدەچێت، دەستەی دادگـای کردنەکـە لـەکاتی دیـاری کـراودا ئامادەدەبن، قەلەڕەشە تاوانبارەکە دەهێـنن لـە ژێـر چـاودێریەکی تونـدا ، کاتێـك دادگـای کردنەکـە دەسـت پێـدەکات قەلـە ڕەشـەتاوانبارەکە سـەری خـۆی دادەخـات و باڵـەکانی شۆڕدەکات و هیچ قیڕەقیڕێك ناکات، ئەمەش نیشانەی دان هێنانە بەتاوانەکەیدا، جـا ئەگـەر دادگـا بڕیـاری لـە سـێدارەدانی بـۆ دەرکـرد و تاوانەکـەی لەسـە چەسـپا کۆمـەڵێك لـە قەلەڕەشەکان هەڵدەستن بەلێدانی بە دەنوکە تیژەکانیان تاوەکو دەیکوژن.

دوای ئەوە یەکێك لەقەلەڕەشـەکان لاشـەکەی بـەدەنوکی دەگوازێتـەوە بـۆ شـوێنێك و چاڵێك بە ئەندازەی لاشەی کوژراوەکە هەڵدەکەنێت و دەیخاتـە نـاوی بـە دەنـوکی خـۆڵی بەسەردادەکات و دایدەپۆشێت، ئەمەش وەکو ڕێزێك بۆ مردوو.

ئا بەم شێوەیە قەلەڕەشەکان دادگەری خوایی لەسەر زەویدا جێ بـەجێ دەکـەن ، کەچـی زۆربەی هەرە زۆری مرۆڤەکان ئەم دادگەریە جێ بە جێ ناکەن؟

دکتۆر: زەغلول ئەجار: (من ایات الاعجاز العلمی الحیوانات فی القران الکریم)

# ئەگەر دە قسەشم پێ بڵێ ی.......!!



. ڕۆژێکیان دەمەقاڵێ یەك لە نێوان (ئەحنەفی کوڕی قەیس) کە بە ئارامی بەناوبانگ بوو لەگەڵ کەسێکی ئاسایی ڕووی دا، کابراکە بە ئەحنەفی ووت ئەگەر قسەیەکم پێ بڵێیت دە قسەت پێ دەڵێم، ئەحنەف ووتی: ئەگەر تۆ دە قسەم پێ بڵێیت من یەك قسەت پێ ناڵێم...!!

کابرا ئاسایی یەکەی زۆر قسەی بە ئەحنەف ووت بەڵام ئەحنەف وەڵامی نەدایەوە، بەردەوام بوون لە ڕۆیشتن تاکو نزیك بوونەوە لە عەشیرەتی ئەحنەف، بۆیە ئەحنەف بە کابرای ووت: ئەگەر هیچ شتێکی تر لەدڵتدا ماوە پێمی بڵێ پێش ئەوەی بگەینە ناو عەشیرەتەکەم بۆئەوەی کەسێکی تر گوێی لێ نەبێت نەوەك ئازارت پێ بگەیەنێت..!

دەگێڕنەوە جارێکیان کابرایەك جنێوی بە یەکێك لەدانا کان ووت بەڵام ئەو وەڵامی نەدایەوە، لە داناکەیان پرسی بۆچی وەڵامت نەدایەوە داناکە ووتی: ئەگەر سەگ پێت بوەڕیت ئایا تۆش وەکو ئەویی ی دەوەڕیت ووتیان: نەخێر،ووتی ئەی ئەگەر گوی درێژ جووتەیەکی لێدایی ئایا تۆش وەکو ئەو جووتەی لێ دەدەیتەوە ووتیان: نەخێر،ووتی ئەی ئەگەر گا جووت قۆچی لێدای تۆش وەکو ئەو قۆچی لێ دەدەیتەوە ووتیان: نەخێر، ووتی کەواتە لێمان گەڕێن با خۆمان جیا بکەینەوە لە ئاژەڵ....!! گرنگ نی یە چیمان بەسەر دێت گرنگ ئەوەیە چۆن بەرە و ڕووی دەبینەوە..!ژیان هەمووشتێك ناداتە هیچ کەسێك کە پێویستیەتی، یان زیاتری پێ دەدات یان کەمتری پێ دەدات...!

# پاشا و سەرباز



پاشایەك بە شەو ڕۆیشتە دەرەوە، بەسەربازە ئێشك گرەکەی گووت: سەرمات نی یە؟

سەربازەکە گووتی : ڕاهاتووم

پاشا گووتی : فەرمان دەکەم ئێستاجل و بەرگێکی گەرمت بۆ بێنن!

بەڵام پاشا لەبیری کرد؟

بەیانی کە لەخەو هەستان بینیان سەربازەکە مردووە! لەسەر دیوارەکە نووسیوویەتی: بەسەرما عادەتم گرت بوو؟؟

بەڵام بەڵێنی جل و بەرگە گەرمەکەت وێرانی کردم و کوشتمی ...؟؟!

# کەوتن مانای دۆڕان نی یە لە ژیان ..!!



**بێل گێتس دەلێت :من لە هەندێك بابەت لە تاقیکردنەوەکان دەرنەدەچووم !**
**بەلام هاوڕێکانم لە هەموو بابەتەکان دەر دەچوون !!**
**لە دوایدا ئەوان بوون بە ئەندازیار لە کۆمپانیای مایکرۆسۆفت !**
**بەلام من بووم بە خاوەنی کۆمپانیای مایکرۆسۆفت!!**

# کۆختە سووتاوەکە



گەردەلوولێکی بەهێز دای لە کەشتی یەك لە ناوەڕاستی دەریاو نقومی کرد... هەندێك لە سەرنشینەکانی دەرباز بوون... لەوانە پیاوێك شەپۆلەکانی دەریا دەیهێنا و دەی برد تاوەکو فڕێی دایە لێواری دوورگەیەکی چۆڵ و دوورەدەست،پیاوەکە خەریك بوو لە هۆش خۆی دەچوو و بە ئاستەم هەناسەی دەدا،زۆری نەبرد لەسەر هەردوو پێ یەکانی وەستا و داوای یارمەتی و هاوکاری لە خوای گەورەکرد و پاڕایەوە کەلەو بارودۆخە ناهەموارە ڕزگاری بکات.

چەند ڕۆژێك گوزەرا پیاوەکە لەبەروبوومی دار و درەختەکانی دەخوارد و بەوە دەژیا هەروەها کەروێشکێکی ڕاو دەکرد ، ولە کوختەیەکی بچوك دەنوست کە لەلق و پۆپی درەختەکان دروستی کردبوو بۆ ئەوەی لە ساردی شەو و گەرمای ڕۆژ بیپارێزێت.

ڕۆژێکیان ،پیاوەکە کەمێك لە دەورووبەری کۆختەکە دەسوڕایەوە تاوەکو خواردنەکەی پێ دەگات کە لەسەر ئاگر داینا بوو کە بەدار و تەختە کردبوویەوە، بەڵام کاتێك گەڕایەوە

سەرسام بوو کە ئاگرەکە هەموو دەورروو بەری گرتۆتەوە،بۆیە هاواری لێ بەرز بووە وە :

بۆچی ئەی خودایە؟....تەنانەت کۆختەکەش سووتا،من لەوجیهان هیچم نەما و من لەو شوێنە زۆر نامۆم، و ئێستاش کۆختەکە دەسووتێ کەتێیدادەنووم..

بۆچی ئەی خودایە ئەو هەموو دەردوو بەڵایە م تووش دەبێت؟!!

پیاوەکە بە زگی برسی و خەمباری یەوە خەوی لێ کەوت،بەڵام لە بەرەبەیان دا شتێکی سەیر و سەمەرە چاوەڕوانی دەکرد،کاتێ بینی کەشتی یەك لە دوورگەکە نزیك دەبێتەوە و بەلەمێکی بچووك دادەبەزێنێ بۆ رزگارکردنی.

بەڵام پیاوەکە کاتێك سەرکەوت بۆسەر ڕووی کەشتیەکە پرسیاری کرد کە چۆن شوێنی ئەویان دۆزیوەتەوە،وەڵامیان دایەوە : (( دوکەڵێکمان بینی،زانیمان کەسێك هەیە داوای فریاکەوتن دەکات!!!)).

پاکی و بێگەردی بۆ ئەو خوایەی هەموو کار و بارەکان بەڕێوەدەبات بێ ئەوەی هەستی پێ بکەین و پێی بزانین...

پەند و ئامۆژگاری لەو چیرۆکە.

* ئەگەر باروو دۆخت خراپ بوو هیچ مەترسە...

تەنها متمانەت هەبێ کە خوای گەورە بەبێ حیکمەت هیچ شتێکت بەسەر ناهێنێ و گومانی باشی پێ بە.

بۆیە کاتێك کۆختەکەت دەسووتێ... بزانە خوای گەورە هەوڵ دەدات ڕزگاری بکات...بەهەر هۆکارێك کە بۆتی هەڵدەبژێرێ و بەڵام.... بەئارام و خۆڕاگر بە...ئارام بگرە....ئارام بگرە.....

# ماسی



پیاوێکی سەرمایەدارو خاوەنکاری ئەمریکی لەکۆتاییەکانی تەمەنیدا لەبەردەم ماڵە زستانییە تایبەتەکەیدا کەلەسەر یەکێك لەرووبارەکانی مەکسیك بوو دانیشتبوو، وایدەزانی لەبەهەشتدا دانیشتووە، هەستی بەخۆشیەکی کەموێنە دەکردبەهۆی هەڵمژینی هەوایەکی پاك و دیمەنە دڵڕفێن و سەرنجڕاکێشەکانی، لەکاتی سەرنجدانیدا چاوی کەوتە سەر ماسیگرێکی ئاسایی لەکەناری رووبارەکەدا. سەیری حاڵی ماسیگرەکەیدەکرد، بەلەمەکەی و کەلوپەلی ماسیگرتنەکەی زۆر سادەو سەرەتایی بوون، چەند ماسیەکیشی راوکرد بوون.

پیاوەسەرمایەدارەکە بانگیکرد بۆ ئەوەی بڕێك ماسی لێبکڕێت و لەگەڵیشی کەوتە ئاخاوتن، دوای کڕینی ماسیەکان لێی پرسی، چەندێك کاتت پێویستە بۆ ئەوەی ئەوبڕە ماسیە راوبکەیت؟

ماسیگرەکە وەڵامیدایەوە: کاتێکی زۆری ناوێت سنیور.

دووبارە لێی پرسیەوە: بۆ کاتێکی زیاتر خەریکی راوکردن نابیت تاوەکو ماسی زیاتر بگری؟

وەڵامیدایەوە: سنیور ئەوەی راومکردووە بەشی خۆم و خێزانەکەم دەکات!

پیاوەسەرمایەدارەکە ئەمریکییەکە پرسیاری لێکرد: ئەی کاتەکانی تـرت بەچـییەوە سـەرقاڵ دەبێت؟

ماسیگرە سادەکە وەڵامیدایەوە: کاتی پێویست دەخەوم ، کاتێکی کەم راو دەکەم ، یاری لەگەڵ منداڵەکانم دەکەم، لەگەڵ خێزانەکـەم نیوەڕۆخـەو دەکـەم و هەنـدێك کـاتی لەگـەڵ بەسەردەبەم، شەوانە لەگەڵ هاوڕێکانم لەناو گوندەکەماندا پیاسەدەکەم، بەیەکەوە دادەنیشین و دەمەتەقێ دەکەین، بەدەر لەکارەکەم کاتی بەتاڵم نییە سەنیور.

پیاوە سـەرمایەدارەکە سـەری لەگێـژەوە هـات بەقـسەپڕ لەگاڵتەجاڕیـەکانی راوچـییە مەکسیکییە سادەکە، دیسان پێـی گـووت: هاوڕێکـەم مـن ئامۆژگارییـەکی زۆربەسـوودت دەکەم، من پیاوێکی خاوەنکاری سەرمایەداری ئەمریکیمو ئەمەش ئامۆژگاریەکەمە:

-یەکەم: پێویستە کاتێکی زیاتر تەرخانبکەی بۆ راوکردن"بۆ ئەوەی زیاتر راوبکەی.

-دووەم: دوای ئەوەی دۆخی مادیت باشتربوو بەلەمێکی گـەورەترو نـوێتر لـەم بەلەمـەی ئێستات بکڕە.

-سێیەم: دوای ئەوەی قازانجت زیاتریکرد چەند بەلەمێکی راوکردن بکڕە.

-چـوارەم: دوای تێپـەڕبوونی ماوەیـەك دەبـی بـەخاوەنی کەشـتیگەلێکی گـەورەی راوکردن،لەبری ئـەوەی کـاتێکی زیـاتر بەسـەربەری لـەوەی راسـتەوخۆ ماسـی بەخـەڵك بفرۆشی، بەناسوودەیی ماسی بۆ فرۆشیاران دابین دەکەیت.

-لەکۆتایشدا: دوای ئەو هەموو سـەرکەوتنە بەئاسـانی دەتـوانی کارگەیـەکی لـەقوتوونان دابمـەزرێنی و دەسـت بەسـەر بەرهـەمهێنانی ماسـی و بـڕی دابەشـکراودا بگریـت، بـەم سەرکەوتنەش لەجیاتی ژیان و مانـەوە لەگونـدێکی بـچکۆلەدا لەشـاری (مەکـسیکۆسیتی) پایتەخت بژی و دواتر بـچی لەئـەمریکا بـژیت، ئـاوا دەتـوانی ببـی بـەملیۆنێرێکی گـەورە کەبەپەنجە ئاماژەت بۆ بکەن!

# کێ فرمێسکی چاوەکانت لێ دەکڕێت؟؟؟؟



فەرقەدی سەبخی دەڵێت: بیستوومانەو بینیومانە کە هەموو کار و کردەوەیەك کێشان و پێوانێکی تایبەتی هەیە، تەنها فرمێسکێك نەبێت کە لە چاوەکانی بەندەیەك دێتە خوار لەترسی پەروەردگاری، کەئەمەیان نە کێشان و نەگەورەیی دیاری کراوە،کە بەو فرمێسکانە چەندان بڵێسەی ئاگری پێدادەمرکێتەوە..!

ئایا گەورەیی ئەو فرمێسکانە نابین کە هەڵی دەوەرێنی، کاتێك یادی خودا دەکەیت؟ یان لێی دەپاڕێیتەوە، لەشەوێکی بێدەنگ و ئەنگوستەچاودا؟؟؟؟!

بچۆ بازاڕ و فرمێسکەکانی خۆت بخەڕوو بۆ خەڵکی، ئایا کەسێك ئەو فرمێسکانەت لێدەکڕێت؟؟؟

ئەوە ئەو فرمێسکانەن کە لە ڕۆژی دوایدا دەریایەك لەئاگردادەمرکێنەوە، ئەم فرمێسکانە لە لای خەڵکی هیچ بەهایەکیان نیە، بەڵام لای پەروەردگارزۆر گەورەو بەنرخن !!!!

ئایا نەت بیستوە کە پێغەمبەری سەروەرمان ( درودی خوای لەسەر بێت ) دەفەرموێت

((دوو چاو لە ڕۆژی دواییدا ئاگری دۆزەخ نایان سوتێنێت: چاوانێك كەلە ترسی خودا گریابێت , چاوانێکیش کەلە پێناوی خودادا پاسەوانی بکەن )).

ئایا ڕۆژێك گریاویت بۆ خۆشەویستی بە دیهێنەرەکەت؟؟

ئایا ڕۆژێك گریاوی لە تامەزرۆیی بۆ دیداری ئەو ؟؟

ئایا ڕۆژێك گریاوی لە سوپاسگوزاری بۆ بەخشینەکانی ئەو؟؟

ئایا ڕۆژێك گریاوی لەترسی ئەو؟؟

ئایا ڕۆژێك گریاوی لە پێناوی ئەو؟؟

ئەگە وات نەکردووە برای شیرینم ، خوشکی بەڕێزم، ئەوا تام و چێژێکی وات لەدەست داوە کە هەر گیز تام و چێژی وات نەبینیوە، بۆ ئەمەش پرسیار لە ئەزمونیاران بکە و لە داناپانی مەکە.

( عەتای سەلەمی) یەکێك بوو لەو کەسانەی کەزۆر دەگریا لەترسی خودا، جارێکیان لێیان پرسی: ئایا بۆچی ئاوا زۆر دەگریت؟

( عەتای سەلەمی) ووتی: بۆچی نەگریم پەتی مردن لە گەردەنم دایە و، گۆڕ جێگامە و، هەڵوێستەکانم و نەیارەکانی چواردەوورم دەڵێن: یان بۆ بە هەشتە یان بۆ دۆزەخ؟؟ ئەگەر ڕێگاکانت لەبەردەم تەسك بوونەوە و، هەستت کرد کە ڕێگات ون کردووە، بەبیرت بێتەوە کە پەوەردگارت چاودێریت دەکات دەت بینێت، هەروەها دێت بۆ لات بۆ ئەوەی لێت خۆش بێت؟؟؟

بۆ ئەوەی لە گوناهەکانت ببورێت، ئەگەرچی گونهەکانیشت گەیشتبێتە کەشکەلانی ئاسمان.....

هەروەك خودا گەورەو بەبەزەیی دەفەرموێت **( واذا سالك عبادي عني فاني قريب أجيب دعوة الداع اذا دعان )**

# پیرەژن و پاشا



پیرەژنێك چوو بۆ لای پاشا بۆ شکات کردن لەسەربازەکانی بە هۆی دزینی ئاژەڵـەکانی کاتێك خەوی لێ کەوتبوو،

پاشا پێی ووت: پێوویست بوو ئاگاداری ئاژەڵەکانت بوای و نە خەوت بووای؟؟؟

پیرە ژنەکە وەڵامی پاشای دایەوە: جەنابی پاشا وام زانی جەنابتان بەخەبـەرن و ئاگاتـان لـە ئێمەیە، بۆیە بەئارامی و دڵ نەوایی لێی خەوتم!!

## سەرچاوەکان

-سەرجەم بابەتەکان لە ئەنتەرنیت وەرگیراون.
-پێگەی دکتۆر عمرو خالد.
-پیگەی صبیا عنج کام.
-پێگەی زانکۆی قەتەر.
-پێگەی قصص وعبر.
-پێگەی أسرار نیوز
-پێگەی شکوماکو.
-پێگەی مدونە التعلیم.
-پێگەی الخلیج.
-پێگەی دامەزراوەوە النور.

# پێرستی چیرۆکەکان

زانستی دەروون ناسی یەکێکە لەو زانستە نوێیانەی بۆتە خولیای ئینسان

لەسەرتاسەری دوونیا برەوو ڕەواجی پەیدا کردووە چەکێکی مەدەنیانەی .

پێشکەو تووە

نوسەری ئەو کتێبەش مامۆستایەکی پسپۆڕ و کارامەو بە ئەزموونە

چەند چیرۆکێکی لە ژیانی ئەزموون کراوی خۆی

لەبواری سەرکەوتن و وورە بەرنەدان ، بۆتۆی خوێنەر کۆ کردۆتەوە

( کتێبخانەی جودی )



قەڵادزێ_تەنیشت بانکی قەڵادزێ

( 5000 )